## ئەم پەرتووکە

پێشکەشە بۆ:
گشت دایکێك کە بە شەونخونی وخۆ بەخت کردنەوە رۆڵەکانی پەروەردە دەکاتەوە، تاکو لە دوا رۆژدا پێیان شاد بێتەوە.

پێش کەشە بۆ:
گشت باوکێك کە بەدرێژایی رۆژ ئارەقە دەرێژێت بۆ ئەوەی بژێوی بۆ منداڵەکانی پەیدا بکات و لەدوا رۆژدا لە ژێر سێبەریان بحەسێتەوە.

پێش کەشە بۆ:
گشت مامۆستایەك کە هەروەکو مۆم دەتاوێتەوە بۆ ئەوەی رێگای رۆڵەکانمان رووناك بکاتەوە و هەموو ئاواتیشی لە ژیان دا بەرهەمی هەبێت و بە بەرهەمەکەی تێنشیر بێتەوە.

پێش کەشە بۆ:
گشت کاربەدەستێکی پەروەردە کە لە بواری پەروەردە و زانستیدا درێغی ناکات و بەدڵسۆزی و دادەوە خزمەتی کۆرپەلەکانمان دەکات.

## سەرەتا:-

پەروەردەی منداڵ کارێکی ئاسان نی‌یە، بەڵکو هونەر و زانستە و هەر لـە پـەروەردەی دایـك و باوکدا دەست پیّ دەکات، چونکە ڕێبازی پـەروەردەیان تـا ڕادەیێکـی زۆر کـار دەکاتـە سـەر پەروەردەی منداڵەیان، هەر بۆیە پێویستە لەســەر گـەنج و عـازەب کـە بیانـەویّ قـەوارەیێکی خێزانی پێك بهێنن بۆ یەکتر شیاو بن و لـەگەڵ یەکتردا بگونجێن و بۆ ژیانی هاوسەرێتی لیّ هـاتووبن و پێـش ئـەوەی چارەنوسـیان بـە یـەکترەوە ببەسـتن لەسـەر ڕێـبازێکی ئاشــکراو دیارکراودا ڕێك بکەون.

وا ئەم کتێبە دەخەمە بەر چاوی خوێنەران کە بریتی‌یە لە هەشت بەندو نـاوەڕۆکی پـەروەردەی منداڵ پێش بوونی تاکو بوونی بە گەنج یان عازەب دەگرێتەوە و باسی ئــەم هۆیانـەی کـە کـار دەکەنە سەر پەروەردەی منداڵ و گیروگرفتەکانی و چارەسازیان کردوومە، لــە خـوای گـەورە دەپارێمەوە کە توانیبم مافی پـەروەردەی راستـەقینەم دابێـت و خزمـەتێکی چاکیشـم کردبێـت، تەواویش هەر بۆ خوای گەورەیە.

دانەر

یعقوب فرسنی ایلی القصاب

## -بەندی یەکەم-
## ((چۆن هاوسەرمان هەڵدەبژێرین؟))

بێ گومان دایك وباوك هەردووکیان بەرپرسن بەرامبەر بە پەروەردەی منداڵیان و هەر دووکیان بەقەد یەك بۆ ئەم کارە گرنگن. منداڵ پێویستی بەهاوڕێی باوکی‌یەتی بۆ دابین کردنی پێویستە سایکۆلۆژی و بایۆلۆژی‌یەکانی. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((تەنیا بەخێوکردنی منداڵ سێیەکی ئەرکی باوکە، چونکە باوك بەرپرسە بەرامبەر بە پێگەیاندنی نەوەیێکی نوێ کاریگەر و نیشتمان پەروەر لەناو کۆمەڵ دا.)) دایکیش بڕبڕەی پشتی خێزانە و رۆڵێکی باڵای لە پەروەردە کردنی منداڵەکانی‌دا هەیە فەرمانی تەنیا شیر دان نی‌یە کە هەموو گیانداریکی شیر دەر ئەمە دەکات، بەڵکو پەروەردەکردنی وەچەیێکە کە خۆشەویستی و بەزەیی و سۆزی مرۆڤایەتیی لێ‌فێر دەبێت. دیسان ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((هیچ سۆزێك ناگاتە سۆزی دایك بۆ منداڵەکانی.)). ((سوکرات))یش دەی وت: ((دڵی ئافرەت گەورەترین سەرچاوەی خۆشەویستی و دڵسۆزی‌یە، هەموو کارێکی گرنگ ئافرەتێکی لەدواوەیە.)). کەواتە پەروەردەکردنی منداڵ فەرمانێکی مرۆڤایەتی‌یە، نەك تەنیا ئەرکێکە دایك وباوك پێی هەڵدەستن. هەروەکو ((شیشرۆن)) وەتەنی: ((گرنگترین دیاری کە پێشکەش کۆمەڵی دەکەین پەروەردەکردنی منداڵەکانمانە.)). ئەگەر منداڵك خێزانێك دا بژێت و ئەویش پڕ لە هێمنی و خۆشەویستی و بەختیاری و دڵنیایی دابێت و هەموو ئەندامانیشی رێز لە یەکتری بنێن و باوەڕ بەیەکتر بکەن و پشت بەیەکتر ببەستن و یەکتریان خۆش بوێت، بێ‌گومان ئەم منداڵە هەست بە هێمنی و ئاشتی و سەربەستی دەکات و فێری متمانە بە خۆو باوەڕ بە خەڵك و سڵ نەکردنەوە لە ژیان و گونجان لەگەڵ کۆمەڵ و سازان لەگەڵ هاورێ یەکانی‌دا دەبێت، کەچی خێزانێك پڕ لە ئاشووبەو ناحەزی ناکۆکی دابێت و مەترسی لە تێك چونی‌دا هەبێت، ئەمانە هەمووی دەروونی منداڵ دەچووزێنن وگیانی دەهەژێنن و هەستی دەورووژێنن و ژیانی دەشڵەژێنن. دکتۆر ((عبدالعزیز القومی)) لە لێکۆڵینەوەیەکیدا لە (٣٠٠) باری لادانی منداڵ دا بەدیاری خست کە بە رێژەی لە ((٧٥ ٪))یان بۆ مایەی تێك چوونی قەوارەی خێزان دەگەرێتەوە. کەچی ((ئۆدیت ڤیلیبۆن)) لە لێ کۆڵینەوەکەی دا بە دیاری خست کە لە (( ٨١،٨٨ ٪))ی لادانی منداڵ بۆ مایەی تێك چوونی قەوارەی خێزان دەگەرێتەوە. لە ساڵی ١٩٤٩دا نزیکەی ((٤٠٠)) هەزار منداڵی تاوانبار درانە دادگایێك بەدیار کەوت لە ((٥٣ ٪))یان نەوەی خێزانێکی ئاشووبە بوون. کەواتە ئاسوودەیی خێزان و پەیوەندی پتەوی نێوان ئەنجامانی کارێکی زۆر دەکاتە سەر دەروون ساغی منداڵ چونکە هەروەکو لەش پێویستی بە ڤیتامینە دەروونیش پێویستی بە هێمنی و دڵنیایی و خۆشەویستی‌یە. راستیان وتووە: ((منداڵ وەك ئەمامە بە خۆشی و تێراوی دەژی و دەبووژێتەوە، بە توندیش دەکووژێتەوە.)). بۆ ئەوەی خێزانێکی بەختەوەر پێك

بهێنین، دەبێ دایك و باوك یەكتریان خۆش بوێت، ئەدی خۆشەویستی خۆراكـی دەروون نی‌یـە؟ مرۆڤ تەنیا بە نان ناژێت و تەنیاش لەش نی‌یە، بـەڵكو لـەش و هـۆش و دەروونـە، هـەروەكو ((پیرەمێرد))ی نەمر دەڵێت:-

لەش و عەقل و دڵ ئەم سێ‌یانە ساغ بێ

صاحیبیان دەبێ هەر بە دەماغ بێ

هەروەها دەبێ هەردوو هاوسەر هەست بكەن كـە نیـاز و ئاواتیـان لـەناو قـەوارەی خـێزان دا هاتۆنەتە دی و هەردەمیش ڕەنج بدەن و ئەرك بكێشن و شانازی بە ژیانیـان بكـەن و ڕێـز لـە مافی یەكتر بنێن و دڵسۆزی بۆ بەرژەوەندی خێزان بنوێنن و دروشمیان ڕەزامەندی و چاوتێری و هێمنی بێت، بۆیە دەبێ مەردوم لەسەر هەڵ بژاردنی هاوسەری خۆی‌دا سـووررو هـاو ڕازو هـاو شانی و ئاستی كۆمەلایەتی‌و دەرامـەتی‌و ڕۆشـنبیری‌یان هاوشـێوە بێـت، بـۆ ئـەوەی گونجـان و هۆگری لە نێوانیان ئاسان بێت. زانایانی دەروون و خووڕەوشت دانیان بـە گرنگـی كنێـت بـۆ ئاڵوگوێزی ڕەوشتە بالاكان لە باب و باپیرانەوە بـۆ نـەوەیان نـاوە و دەڵێـن: ((مـاخی زگمـاك كەرەستەی خاوە، مەلبەندیش پوختی دەكاتەوە))، هەر لەبەر ئەمەش كورد دەڵێت: ((ژنێ بێنـە لە بنەماڵان، خوارزا دەچنەوە سەر خالان.)). لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كەوا ماخە كنێتەكان و ڕەفتـارو هاوسـەرو خـزم و كەسـانی كـارێكی گرنـگ دەكەنـە سـەر بـەختیاری خـێزان و پەروەردەی منداڵ، بۆیە دەبێ پێش ئەوەی چارەنووسمان بە ئافرەتێك ببەستین شارەزای ڕەوشـتی خۆی و دایك و باوك و خزمەكانی ببین و بە چاكیش لە ئاكاری‌یان بكۆڵینـەوە و ئـەوانیش لـە تاكسایی و ناوێزە و ڕێزپەڕی ولادانـدا و ئابڕوو گران و سەنگین بن و ژینامەیان خـاوێن و پـاك بێت و بەهاو بەهرەیان لە ژیان داهەبێت. ((ناپلیۆن)) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((پەروەردەی منداڵ بە بیست ساڵ پێش بوونی یـەوە دەسـت پـێ دەكـات، چونكـە پـەیوەندی یـەكی تونـد نێـوان پەروەردەی منداڵ و پەروەردەی دایكی هەیە كە خۆی بەشێكە لـە دایكـی‌دا.)). منداڵـی كـوڕ لەدایكیەوە فێر دەبێت چۆن لەگەڵ نەژادی مێ‌ینەدا بگونجێت و پەیوەندیشی پی‌یەوە كاردەكاتـە سەر پەیوەندیی بە نەژادی ترەوە، دووریش نی‌یە هاوسەری خۆی لەسەر هەمان شـێوازی دایـك لە ژیان دا هەڵ بژێرێت، منداڵی كچیش كەسیەتیی دایكـی لـەناو دەروونـی‌دا دەمۆرگێنێـت و نەریت و شێوازە مێ‌ینەكانی لاسـادەكاتەوەو ئـابڕوویی و داوێـن پـاكی و گـران و سـەنگینی و شكۆیی‌ی لێ فێر دەبێت و پەیوەندیشی بە ئافرەتانی تر لەسەر ڕۆشنایی پەیوەندیی بە دایكی‌یـەوە ڕادەوەستێت، چونكە منداڵ هەستەكانی لە عاستی دایك و باوكی‌یەوە بە ڕێگایێكی ئـامێری بـۆ گەوران ئاڵو گوێز دەكاتەوە. ئەگەر كورد بڵێت: ((هەنگ لە ماكی، كچ لە دایكی)). كەواتـە با بەپێی ئامۆژگـاری ((ڤۆلـرس)) بكـەین كـە دەڵێـت: ((كچـی دایكێكـی خووڕەوشـت پـاك بخوازە.)) بۆ ئەوەی ئەم چەمكە چاكتر بە دیار بخرێت با سەرنج بدەینە تاقیكردنەوەی مـەردوم یـك

که له چیرۆکه‌که‌ی‌دا ده‌ڵێت: ((خۆم به به‌خته‌وه‌رترین مه‌ردم ده‌زانم، له ژیانی هاوسه‌ریم دا شادم، چونکه توانیم هاوبه‌شی ژیانم به‌سه‌رکه‌وتن هه‌ڵ بژێرم، کاتێ بڕیارم دا ژن بهێنم، هێشتا دڵم به هیچ په‌یوه‌ندیه‌کی سۆزی نه‌به‌سترابوو، بۆیه هه‌ڵ بژاردنه‌که‌م له‌سه‌ر رووکاری هۆش دا بوو نه‌ك سه‌ر رووکاری سۆزی سه‌ره ڕۆ، ئه‌ویش رۆژێکیان هه‌موو ئه‌ندامانی خێزانه‌که‌مان بۆ ئه‌م مه‌به‌سته دانیشتن، له پێشه‌وه ناوی چه‌ند کچی عازه‌بمان له خزم وکه‌س و نسیاومان نووسی که له هه‌ڕه‌تی شووکردن دابوون، ئه‌و ساکه ده‌ستمان به هه‌ڵ سه‌نگاندنیان کرد، یه‌که‌م کچمان له لیسته‌که‌دا سڕییه‌وه چونکه دایکی درۆزن و به‌دفه‌ڕ و زمان شڕبوو و هه‌میشه ئاژاوه له ناوماڵ و له‌گه‌ڵ خه‌ڵك دا ده‌سازاند و نه‌ده‌گونجا، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا ده‌وله‌مه‌ند بوون، ناوی دووه‌م کچیش سڕایه‌وه چونکه لووت به‌رز و له‌خۆبایی بوو، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا فێرنامه‌ی به‌رزی هه‌بوو. ئه‌وانی تریش هه‌موویان له جوانی و پله‌ی رۆشنبیری و ده‌رامه‌تی‌دا مام ناوه‌ندی و هاوتا بوون، ویستمان باشترین کچ له ره‌فتار باشی و ئابروویی‌دا هه‌ڵ بژێرین، به‌ڕاستی نه‌مان توانی جیای بکه‌ینه‌وه، چونکه هه‌موویان به داوێن پاکی و ژیاننامه‌ی خاوێن و شه‌رم و حه‌یاوه ناوداربوون، له دوایی‌دا بڕیارمان -دا- باشترین دایکیان هه‌ڵ بژێرین.)) هه‌روه‌کو کورد وه‌ته‌نی ((دایه ببینه دوێته بخوازه.)). مه‌ردومه‌که له‌سه‌ر گێڕانه‌وه‌ی چیرۆکه‌که‌ی دا به‌رده‌وامه‌و ده‌ڵێت: ((دایکی یه‌کێکیان که ئێستا خه‌سوومه نموونه‌ی نایابه له چاوتێری و داوێن پاکی‌داو هه‌موو به ئارامی ئۆقره‌یی و پشوو درێژی و ره‌فتار نه‌رمی‌یه‌وه ستایشی ده‌کات و له‌گه‌ڵ مێرده‌که‌دا ده‌گونجێت و خۆشی ده‌وێت و ڕێزی لێ‌ده‌نێت و بۆ خێزانه‌که‌ی دڵسۆزه، ئینجا کچی ئه‌و دایکه نایابه‌مان هه‌ڵ بژارد بۆ ئه‌وه‌ی ببێت به هاوسه‌رم،



ئه‌زموونی ژیان ڕاستی بڕیاره‌که‌مانی به دیار خست که چۆن هاوسه‌رم ئاوێنه‌ی راسته‌قینه‌ی دایکی‌یه‌تی. ئه‌وساکه وا رێك که‌وت په‌یوه‌ندی دۆستایه‌تی خێزانیمان له‌گه‌ڵ ئافره‌تانی دی ومێرده‌کانیان ببه‌ستین، زۆر جاریش گرفته‌کانیان شیته‌ڵ ده‌که‌ینه‌وه و به‌زه‌رده‌خه‌نه‌وه سه‌یری یه‌کتر ده‌که‌ین و هه‌روه‌کو بڵێین خوایه لێمان تێك نه‌ده‌یت.)). ئه‌گه‌ر بمانه‌وێت نه‌وه‌یێکی کاریگه‌ر بهێنینه کایه‌وه، ئه‌گه‌ر بمانه‌وێت

پەروەردەی منداڵمان بە ڕێبازێکی ڕاستەقینە بڕوات، پێویستە هاوسەرمان بۆ ئەم پەروەردەیە لێ هاتوو بێت، چونکە منداڵ لاسای هەڵسوکەوتەکانی دەکات و ماخە کنێتەکانیشی ئاڵو گۆڕ دەکاتەوە و ڕەوشتە باڵاکانیشی لێ‌فێر دەبێت، ئایا نەوتراوە: ((دایك بناغەی چاك و خەرابی منداڵی‌یەتی؟)). بۆیە دەبێ هەڵ بژاردنی هاوسەر لەسەر ڕووکاری هۆش بێت وبێ پەلە بێت و نەك لەسەر ڕووکاری سۆزی گازاو بێ ئارام دا بێت. ((کۆنگریف)) دەڵێت: ((ئەوەی بەپەلە ژن بهێنێت بە شێنەیی پەشیمان دەبێتەوە.)) کەچی ((ئارنۆلد بێنێت)) دەڵێت: لە ((٣٣ ٪)) ی بارەکانی دڵداری تیژ دوای سێ ساڵ لە ژیانی هاوسەری‌دا بۆ سۆزێکی خامۆش دەگۆڕێت و لە ((٥٠ ٪))ی بارەکانی دەبێتە مایەی بێ بایەخدان بە پەیوەندیی هاوسەری‌دا و لە ((١٦ ٪))ی بارەکانی بۆ ڕق وکینە وە دەگەڕێن، تەنیا لە ((١ ٪))ی بارەکانی‌دا سەردەکەوێت، لەوەوە بەدیار دەکەوێت کەوا ژیانی هاوسەریی سەرکەوتوو لەسەر دڵداری تیژو بەڕێکەوت دا ڕاناوەستێت، بەڵکو خۆشەویستی بە مانای فراوانی بنەچەی ژیانی هاوسەریی سەرکەوتووە، کە بە تێ‌گەیشتن و گونجان و هاوکاری گەشە و نەشونما دەکاتەوە، کە ژیانی دوو مرۆڤ هاوبەش دەبێت و چارەنووسیان پێکەوە دەبەسترێت و نەوەیێکی نوێ پێك دەهێنن، ئەویش خۆشەویستی و سۆزی مرۆڤایەتی‌یان لێ فێردەبێت بی تایبەتی لە دایکی‌یەوە، چونکە زیاتر پێ‌ی نووساوە و متمانەی پێ‌دەکات و چارەنووسی دەست نیشان دەکات. هەروەکو ((جۆبێر)) ڕۆژ هەڵاتناسی فەرەنسی (١٧٧٩ ١٨٤٧) وتویەتی: ((ئافرەت پێوانەی پێشکەوتنی گەلە.)). ((بەلزاك))یش دەڵێت: ((پیاوان لەدەست کردەی دایکیانن.)). ((دۆستۆیڤسکی))یش چیرۆك نووسی ڕووسی دەڵێت: ((دایکم بوو فێری بەزەیی کردم.)). دەربارەی هەڵ بژاردنی هاوسەر زانایێك بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: ((نامەوێت زۆر بێت خەڵك بە چاوی پیسی تەماشای بکات، نەئەوەندەش ناشرین بێت نەتوانم لەگەڵی بدوێم، نە ئەوەندە درێژ بێت باڵای خۆمی بۆ درێژ بکەم، نە ئەوەندەش کورت بێت بۆی دابێمەوە، نەئەوەندە قەڵەو بێت دەرگای سروەی بەیانیانم لێ دابخات، نە ئەوەندەش لاواز بێت کە وەکو پەیکەر بێتە بەر چاوم، نە ئەوەندە سپی بێت وەکو مۆم بێت نەئەوەندەش ڕەش بێت وەکو جنۆکە بێت، نە نەخوێندەوار بێت هیچم لێ تێ‌نەگات و نەفێرنامەی لەمن بەرزتر بێت کە تێی نەگەم، نە دەولەمەندبێت و بڵێت: ئەمە ماڵ و سامانمە، نە ئەوەندەش هەژار بێت منداڵەکانمی بە هەژاری و دەردەسەری بە خێوبکات.)).

## بەندی دووەم
## ((پەروەردەی منداڵ پێش لە دایك بوونی))

دوای ئەوەی مەردومەكە توانی هاوسەری خۆی بەسەر كەوتووانە هەڵبژێرێت، ئەوساكە پێویستە لەسەر هەردووكیان هۆگری و گونجان نێوانیان و نێوان خزم وكەسیان بسازێنن و بە خۆشەویستی و رێز گرتن و تێگەیشتن و خۆبەخت كردن قەواری خێزانیان بپارێزن. چاك وایە قەوارەیەكی خێزانی سەربەخۆیی بۆ خۆیان دابمەزرێنن، چونكە مەردوم هەرچەند بەتەمەن گورە بێت لە عاستی دایك و باوكی‌دا هەر خۆی بە بچووك دەزانێت، ئەم نیگایەش دەبێتە مایەی تەگەرە كەوتن بەر سەربەستی‌یان، لە لایێكی دیش هەست بە تاوانباری دەكەن دوای پرۆسێسی رەگەزی سەبارەت بەوە هەرلەوەتی منداڵ بوون دایك و باوكیان بە بەددی لە قەڵەمیان داوە. دەروونناسان رایان گەیاندووە كە باری دەروون هێمنی كە بە پەیوەندیی باش نێوان ژن و مێرد دێتە كایەوە كاردەكاتە سەر پرۆسێسی پیتێن ، هەروەها دەڵێن: ((ئەگەر تەگەرەێك لە پرۆسێسی پیتێن دا لەلای ئافرەتەوە هەبێت و بەهۆی كەمو كووڕی ئۆرگانی نەبێت لە زۆربەی بارو دۆخ دا بە هۆی گرفتی دەروونی‌یە هەروەكو ترس و راڕایی و دڵە خورتە )). بۆیە دەبێ بۆ ماوەێك چارەسەری ئافرەتی دەروون نەسرەوت بگرێت تاكو بۆ پیتێنی سەركەوتووانە ساز بێت. ((رۆثمان))ی زاناو برادەرانی لە ساڵی ۱۹٦۲ دا رایان گەیاند كە توانییان چارەسەری دەروون نەسرەوتی شەش ئافرەتی بێ پیتێن بكەن و منداڵیشیان ببێت، هەروەها ((كرۆجر)) و برادەرانی لە ساڵی ۱۹٤٦ دا توانییان دەروونی ((۲۱)) ئافرەتی نەسرەوت هێمن بكەن و منداڵیشیان ببێت.هەروەها دەبێ هەردوو هاوسەر حەزبە منداڵ بوون بكەن بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوانیان زیاتر پتەوبێت و بە سۆزی دایكایەتی و باوكایەتی‌یان ببەستێت، دەبێ ئافرەتیش خۆی بۆ خۆشەویستی منداڵەكەی و خۆبەخت كردن ساز بكات و دڵیشی پڕ لە سۆزی دایكایەتی بێت. وێژەوانێكی پۆلەندی دەڵێت: ((دڵی ئافرەت هەروەكو شانەی هەنگوینە ئەگەر بە سۆزی دایكایەتی پڕ نەبێت دەشێ ببێتە چاوگەی دڕندایەتی.)). هەروەها دەبێ ئافرەت لە توانای ئابووری مێردەكەی‌دا دڵنیا بێت و بۆ سیفەتی باوكایەتی شیاو و رەوان بێت، چونكە هەست كردنی ئافرەت بە خامۆشی ودڵنیایی كاردەكاتە سەر زگ پڕی. كەچی ئارەزوو نەكردنی ئافرەت بۆ منداڵ بوون بەهەر هۆیێك بێت دەبێتە مایەی دەردانی تۆوی پاو لە منداڵدانی دا بە رێگایێكی نەستی‌دا. ((اشتیكل)) دەی وت: ((رشاندنەوەی ئافرەتی زگ پڕ ئەوە دەگەێنێت ئافرەت منداڵەكەی ناوێت.)). كەواتە قۆناغی زگ پڕی پڕە لە گیر و گرفت و هاڤركێی دەروونی و ترس و راڕایی‌دا، دەشێ ئافرەت بیر لەوە بكات ئەوەكو منداڵەكەی بەكەمایەتی بڕسكێت، خۆ ئەگەر مێردەكەی خۆش نەوێت، ئەوساكە كۆرپەلەی زگیشی خۆش ناوێت و هەروا دەزانێت كە شتێكی گرانی هەڵ گرتووە. بەسەر ژماردن لە فەرەنسا لە ساڵی

١٩٣٣ دا نیو ملیۆن بــاری منــداڵ فڕێ دان هاتــە ڤاپــەوە و لــە ســاڵی ١٩٣٨ دا گەیشتە ملیۆنێك و لە ساڵی ١٩٤١ گەیشتە ((٨٠٠)) هــەزار لەمــەش را دەگەیــەنێ کــە ئـافرەت نایەوێت بەرپرسیاریی دایکایەتی بخاتە ئەستۆی. زۆربەی دایك و بـاوك حـەز دەکـەن نۆبـەرەیان کوڕ بێت و زیاتر جێی ڕەزامەندی‌یان دەبێت و بە ڕوونـاکبینی پێشـوازی لێ دەکـەن، هـاودژی ئەمەش ئەگەر کچ بوو، ئەمەش کارێکی نارەوایەو نابێ بە هیچ جۆرێك جیاوازی نێوان نێر و مێ بکەن. نوسەرێکی ئەمەریکی لە ((لاند رۆڤەر)) لێ کۆلینەوەیێکی بەسەر ((١٠)) هەزار ئافرەت دا کرد، دیتی لە ((٧٠ ٪)) یان بایەخ بە رەگەز نادەن بەقەد ئەوەی کە مێردەکانیان بەشداری هەستیان بکەن و ڕێزیان لێ بنێن و خۆشیان بوێن وبیان دووێنن، ئەم مامەلەیە کار دەکاتە سەر بوونی نەژادی نارەزوومەند. دەروونناسێکی ئەمەریکی دەڵێت: ((کاری ژن و مێرد تا رادەیێکی زۆر نەژادی زایگۆت دەست نیشان دەکاتەوە، ئەگەر پیاو زیاتر تووشی ماندوێتی بووبێت دەشێ کچیان ببێت، ئەگــەر ژنەکــەی زیـاتر توشــی مـاندوێتی بووبێـت دەشــێ کوڕیـان ببێـت، ئـەو دەروونناسە تیۆری‌یەکەی لەسەر مشکان دا تاقی کردەوە و ڕادەی ڕاستی‌یەکەی لە ((٧٣ ٪)) بوو. کەچی زانایان دەڵێن: ((باوك بەرامبەر بە دەست نیشان کردنی نەژادی منداڵ بەر پرسە.)) بـۆ ئـەم مەبەسـتەش چـەند تاقیکردنـەوەیێکیان لەســەر گیانـەوەران دا کـردووە، ئـەویش بـە جیاکردنـەوەی ((سپێرماتۆسـایت)) لــە مێینــە خانــەی تــۆوی پیـاودا بــە هــۆی ئــەم بارگــە کارەبایی‌یانەی کە لەسەر ئەم خانانەدا هەیەو ئەوەی مەبەستیش بێت وەربگـیرێت و گیانـەوەری مێینەشی پێ ئاووس بکرێت. دکتۆر ((لاندوم شیتلرز)) لە زانکۆی ((کۆلۆمبیـا))دا گەیشـتۆتە دانانی پێك هاتووێك بۆ ژن ومێرد، ناوبراو ئامۆژگاری مێرد دەکات بۆ ئــەوەی دوو کـەوچك لە سۆدەی نان بخاتە ناو چارەکە گالۆنە ئاوێك و پێش جووت بوون بی خواتەوە ئەگەر بیەوێت کوڕی ببێت، خۆ ئەگەر بیەوێت کچی ببێت، دەبێ دوو کەوچك سر کە لەگەڵ چارەکە گالۆنە ئاوێك پێش جووت بوون بخواتەوە، نوژداران دووپات دەکەنەوە کەوا ڕێژەی ســەرکەوتنی ئـەم ڕێگایە دەگاتە نێوان لە ٧٥ ٪ - ٨٠ ٪ دا.

مـاوەی زگ پــڕی نێــوان (٢٥٠-٣١٠) ڕۆژە و بــەتێکرایی ((٢٨٠)) ڕۆژە و بە ((٣)) تاودا دەڕوات:-

١- تاوی پێتێن: ئەم تاوە سێ هەفتە دەخایەنێت، لەم تاوەدا پەردەکانی کۆرپەلە پێك دێن و نەژاد و ماخە کیتەکانیشــی دەست نیشان دەکرێن.

٢- تاوی ئاو لە مەخانەیی: ئەم تاوە لەســەرەتای هەفتــەی چوارەم دا دەست پێ‌دەکات و تا کۆتایی هەفتەی هەشــتەم. لەم تاوەدا نەشوونمایێکی خێرا ڕوودەدات و لە پێشەوە چینی

دەرەوە پێك دێت کە لە پێست و قژو نینۆك هەندێ بەشـەکانی ددان و ڕشـتەی دەمـاردا بریتییە، پاشـان چینـی نـاوەند کـە ماسـوولکەکان و ڕشـتەی دەردان و سـوڕانی خوێـن دەگرێتەوە، ئەنجا چینی ناوەوە کە جۆگەی هەرس و هەندێ گلاندە دەگرێتەوە. بە کۆتـایی مانگی دووەم قەوارەی ئاولەمە خانە بەڕادەی لە سـەتا ملیۆنێـك لـە چـاو پێشـن دا زیـاد دەبێتەوە.

٣-تاوی زیگۆت: لەسەرەتای مانگی سێیەم دا دەست پـێ دەکـات تـاکو لـە دایـك بوونـی منداڵەکە، ئەم تاوەش تەواوکەری تاوی دووەمە لەلایەن گەشەکردنی لەش دا، بە کۆتـایی ئەم تاوە بەژنی منداڵەکە ((٤٥ ٥٠)) سـم دەبێـت و کێشیشـی دەگاتـە ((٧ ٧،٥)) پاوەند، ئەوەی شایانی باسە هەستەکانی منداڵ هەموویان بە جارێك گەشە ناکەن، چاو هەر لە هەفتەی سێیەمی ژیانی کۆرپەلەدا نەشونما دەکاتـەوە، بـەڵام نـاتوانێ پێش لـە دایـك بوونی بی وروروژێنێ، کەچی ڕشتەی بیسان بۆ کار کـردن ئامادەیـە، منـداڵ کـە لـەدایك دەبێت هێشتا نیمچە کەڕێکە تـاکو جۆگـە ئۆسـتاکی یەکـەی بـە هەناسـەدان و قیژانـدن بکرێتەوە، بە تاقی کردنەوە بەدیار کەوتووە منـداڵ لـە تەمـەنی ((٣١)) هەفتـەیدا وەڵامـی هەندێ دەنگی بەرز دەداتەوە هەروەکو دەنگی زەنگ کە لێی نزیك بێـت، بـەڵام هەسـتی بۆنی هەڵ ناچێت تاکو بۆشایی کونە لووتـی پـڕی هـەوا نـەبێت، چونکـە پـڕە لـە شـلی ئامینۆنیدا، کەچی هەستی بەرکەوتنی بە تەواوەتی پێگەییوە.

### بایەخ دان بە تەندروستی ئافرەتی زگ پڕ:-

باری دەروونی ئافرەتی زگ پڕ کارێکی گرنگ دەکاتە سەر گەشە کردنی کۆرپەلەی، دایکێـك هێمن و خامۆش بێت و پەیوەندیی دۆستایەتی وەفاداری لە ماڵەکەی دا هەبێت کۆرپەلەکەشـی بەبێ تەگەرە پێدەگات و دوای بوونیشی هێمن دەبێتەوە نوژداران دەڵێـن: ((ئـەوەی مێـرد بـۆ ژنەکەی لە خۆشەویستیو مامەڵەی نەرم و ڕێز لێ نانی لە کاتی زگ پـڕیدا دەنوێنێـت خێـرو بێرێکی زۆر بـە منـداڵ و بـەختیاریی خێـزان دەبەخشـێت،



هەروەها هێمنی ئـافرەت لـە کـاتی زگ پـڕی و دوای زگ پڕی دا کاردەکاتـە سـەر شـێرەکەی کـەچی ژیـانی خێزانی ئاشـووب و نـاکۆکی و ناحـەزی دەروونـی ئـافرەت دەوروژێنێت ئەمـەش دەبێتـە مایـەی ڕوودانـی گۆڕانێکـی گەرگـانی فسـیۆلۆژی لەلەشـیدا هـەروەکو شـێواندنی گلاندەکان، ئەمەش قۆرت دەخاتە بەر حەوانەوەی کۆرپەلەو گەشەدانی. دەشـێ دایکـی دەروون نەسرەوت کۆرپەلـەی

لەبەر بچێت، لەساڵی ١٩٤١ دا بۆ یەکەم جار زانا ((سـۆنتاج)) لـە لێ کۆڵینەوەیـەکیدا رای گەیاند کە ماددە کیمیاوییەکان کە لە ئەنجامی غەم وپەژارەو گرفتـە دەروون و گـرژە سـۆزدا پەیدا دەبنەوە و بەرێچکەی پزدانەوە بـۆ کۆرپەلـە ئـالو گوێـز دەبنـەوە و زیـانێکی زۆری پـێ دەبەخشن هەتاکو دوای بوونیشی، چونکە خوێنی دایك ژاراوی دەکەن. هەروەها دەبێ ئـافرەتی زگ پڕ بە پێی رێنمایەکانی نوژدار داو دەرمان بخوات، پرۆفیسور ((النجـورث)) لیسـتەیێك بـە ناوی ((٧٠)) داو دەرمانی زیان بەخشی بە کۆرپەلە داناوە و لـە گۆڤاری ((لمـز))ی بـەریتانیادا تۆماری کردوون و ئافرەتی زگ پڕیانی لێ دوور دەخاتـەوە. بـۆ نموونـە ئەگـەر دایکێـك پێـك هاتووی ((ڤالیدومالید))ی خوارد بەمەبەستی ئـەوەی خـەوی لێبکـەوێت، ئـەم کـارەی دەبێتـە مایەی شێواندنی کۆرپەلەی بە درێژایی ژیانی هەروەکو بە دەست بازووی لاوازی بهێنێت، خـۆ ئەگەر بە نەفامی ماددەی ((کنین))ی خوارد دوورنییە کۆرپەلەی هەر لـە زگمـاکی کـەرببێت.
هەروەها هۆرمۆنی ((ئەستۆجین)) و ((برۆجستۆن)) و دەرمانی ((ئەکیۆتین)) کۆرپەلـە تووشـی نە خۆشیی هەمە جۆرەی دەکەن، ((تێتراسایکلین))یش ددانی منداڵ پۆخڵ دەکات. هێمـن کـەرە سووکەکان کە ((میرۆبـامیت)) یـاخوت ((بنزۆدیـازفین))یـان تێدایـە دەبنـە مایـەی شـێواندنی لێوەکانی کۆرپەلە بە تایبەتی ئەگـەر لـە کـاتێکی زووەوەی زگ پـڕی دا خـواردران. کـەچی ((ئەسپرین)) و ((ئەبۆ برۆفین)) ئەگـەر لـە تـاوی دوایـی زگ پـڕی دا خـواردران مـاوەی ژان کێشانی درێژ دەکەن و دەبنە مایەی خوێن پژان لە پێش و پاش زانیدا.
خوادەمەنی ئافرەتی زگ پڕ کار دەکاتە سەر نەشونمای کۆرپەلە، کەمووکووڕی لە خواردنیدا دەبێتە مایەی کەمووکووڕی لە لەش و هۆش و دەروونـی منداڵەکـەی لـە ژیـانی داهـاتوویدا چونکە بە هۆی خواردەمەنییەوە پرۆسێسی بنیاتنـان روودەدات، بۆیـە پێویسـتە لەسـەر دایـك بایەخ بە خواردنی بـدات، گۆشـت و چەشـنەکانی و دانەوێڵـە بـۆ بنیاتنـانی خانـەکانی لـەش پێویست، ڤیتامینەکانیش یاریدەی نەشـونمای کۆرپەلـە دەدەن و بـەرگری دژی نەخۆشـییەکان دەبەخشن ئەمانەش لە میوەی تازەو سەوزەو هێلکە و گۆشـت دا هـەن وشـیر و بەرهەمـەکانی میوە پڕن لە خوێی کالسیۆم و فۆسفۆر و ئاسن کە بۆ گەشە کردنی ئێسقانی کۆرپەلە پێویستن، هەروەها پێویستە شلەمەنی زۆر بخواتەوە تاکو خوادەمەنی هەرس بکرێـت و دووچـاری گرفـت نەبێت، بەڵام دەبێ زۆر شیرینی و چەوری نەخوات.
پێویستە لەسەر ئافرەتی زگ پڕ ئاگاداری تەندروستی خۆی بێت، چونکە نەخۆشـی بـە تایبـەتی نەخۆشییە درمیو کنێتەکان کاردەکەنـە سـەر هـەردوو پرۆسێسـی بنیاتنـان وتێـك دان و لـە ئەنجامیشدا سەر گەشەکردنی کۆرپەلە. بۆ نموونە نەخۆشـیی ((سـفلیس)) دەشـێ ببێتـە مایـەی هۆش لاوازی یان کەڕی یان کوێریی کۆرپەلـە، کـەچی شـێواندنی دەردانـی لـووە کوێرەکـان دەشێ تەگەرە بخاتـە بـەر گەشـەکردنی کۆرپەلـە. هـەروەها نەخۆشـی ((درکـە)) کـە دەشـێ

دووچاری دایك بێت لە میانی سێ مانگەی یەکەمی زگ پڕیدا کارێکی مەترسی هەیە لەسەر چاوو گوێ و دڵ و گشت هەستەکانی کۆرپەلە. ئاوسانی قاچیش نەخۆشی یە دەبێ چارەی بکرێت، ((دڵە کزی))یش کە لە ئەنجامی شێواندنیپرۆسێسی هەزمدا روودەدات دەبێ چارەی بکرێت. هەروەها هەندێ نەریتی بەدد کە دەشێ ئافرەتی زك پڕ خووی پێیان گرتبێت هەروەکو جگەرەکێشان و مەی خواردنەوە دەبنە مایەی مەترسی بۆ کۆرپەلە، چونکە ئەم نەریتانە کاردەکەنە سەر نواندنی خوادەمەنی و تەنگە هەناسەی خۆی و کۆرپەلە، هەروەها پێویستە لەسەری چاو قاوەی زۆر نەخواتەوە و خۆیشی لە نەریتی بەددا لابەلا بکاتەوە. ئەوەی شایانی وتنە کۆرپەلە بە هۆی سی‌یەکانیەوە گازی ئۆکسجینی وەدەست ناکەوێت بەڵکو هەروەکو خواردەمەنی بە هۆی پزدانی دایکی‌یەوە وەدەستی دەکەوێت، خۆ ئەگەر ئۆکسجینی کەمی وەدەست کەوت خۆی لەناو زامالّی دایکی‌دا دەنووشتێت، بەڵام ئەگەر زۆر کەمی وەدەست کەوت دەشێ بخنکێت یان دوای بوونی تووشی دواکەوتووی هۆش ببێت. بۆیە دەبێ ئافرەتی زگ پڕ هەردەم هەوای پاك وسازگار وەربگرێت و هان بدرێت لەناو باوەشی سرووشتدا بجمێت و هەوای بەرەڵلا وەربگرێت و لەناو ژوورێکی هەواگۆرکێدا دانیشێت و بخەوێت و لەشوێنی قەرەبالغ دا دوور بکەوێت. ئامۆژگاری ئافرەتی زگ پڕ دەکرێت بۆ ئەوەی بە چەند راهێنانێکی وەرزشی هەڵبستێت تاکو ماسولکەکان زگ و پشتی پتەو ببنەوە بەتایبەتی لە قۆناغی دوایی زگ پڕی‌دا تاکو بوونی منداڵەکە ئاسان ببێتەوە، باشترین راهێنان ئەوەیە، خۆی لە سەر دەستەکانی ڕابگرێت و ئەژنۆی لە سەر زەوی دابنێت و سەری بەرز بکات و پشتی جارێك نزم و جارێکی تریش بەرز بکاتەوە و چەند جارێکیش ڕاهێنانەکە دووبارە بکاتەوە بە مەرجی لە میانی خۆ چماندن و ڕاست کردنەوەدا هەر دوو پرۆسێسی هەناسە وەرگرتن و هەناسە دان ڕێك بخاتەوە، باشترین وەرزش ڕۆیشتنە لە ناو هەوایێکی بەرەڵلادا، بەم وەرزشە خۆی و کۆرپەلەی هێمن دەبنەوە و هەست بە خامۆشی دەکەن و هەوای فێنك و خۆشیان وە دەست دەکەوێت و لەشیان دەحەسێتەوە، پێویستە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بڕوات هەتاکو مانگی نۆیەم و دەشتوانی ئیشەکانی ماڵ ڕاپەڕێنێت بە مەرجێ شتی قورس وەرنەگرێت و بۆ وەرگرتنی شت لە کاتی ڕاوەستان دا دانەیێت، کە هەستی بە ماندوێتی کرد پێویستە خۆی درێژ بکات و سەرینێك ژێر سمتی دابنێت و قاچەکانی هەندێك بەرز بکاتەوە. هەروەها پێویستە ڕۆژێ هەست سەعات بخەوێت و هەر چۆنێکیش بخەوێت ئاسایی‌یە و کۆرپەلەی دەتوانێت بجوولێت، بە مەرجێ زووری نووستن مەرجەکانی ڕووناکی و هەوا گۆڕگێی هەبێت. با خۆی ماندوو نەکات وشەو چەرەی کەم بێت و لە دوای نانی نیوە ڕۆدا بە لانی کەمەوە سەعاتێك بخەوێت و دەبێ هەموو ڕۆژێکی هاوین خۆی بشوات و لە زستانیش دا هەفتەی دوو جار خۆی بشوات. پێویستە لە سەر ئافرەتی زگ پڕ ناو بە ناو دیدەنی مەڵبەندی ئاگاداریی تەندروستی بکات بۆ ئەوەی لە ژێر

سەر پەرشت و ئاگاداریی نوژداری بێت و بە پێی ڕاسپاردەکانی دەربارەی کێش و خواردن و کوتانی هەڵسوکەوت بکات. هەروەها جلکەکانی ئافرەتی زگ پڕ دەبێ فراوان و تەنك و بێ پەناو پێچ بن و دەشبێ جلکی لاستیك و پشتدێن لە بەر نەکات، هەروەها پێویستە لە نیوەی دووەمی ماوەی زگ پڕیدا خۆی لە گەشت و گەڕاندا دوور بخاتەوە چونکە ماندووی دەکەن.

## بەندی سێیەم
## ((پەروەردەی منداڵ لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە))

زۆر لە شارەزایانی پەروەردە دانیان ناوە کە کەسیەتی منداڵ هەر لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە بنجی دادەکوتێت وبناغەی دادەمەزرێنێت و گیا لەسەر بنچی خۆی شین دەبێتەوە. ((چین))ی دەروونناس دەڵێت: ((کەسیەتی منداڵ هەر لە هەفتەنی یەکەمی تەمەنی‌یەوە دادەمەزرێت.)). بەڵگەی ڕای ئەو شارەزایانە ئەوەیە گوایە منداڵ لەم ساڵەدا شارەزایی ی گەشبینی یان ڕەشبینی لە میانی مەست کردنی پێویستی‌یەکانی و ڕێبازی ئاگاداریی‌دا وە دەستی دەکەوێت. هەروەها منداڵی یەك ساڵە دووچاری نەخۆشی هەمە جۆرە دەبێت و ئەم نەخۆشی‌یانەش جێی مەترسین هەروەکو ((گێری، هەوکردنی سی و ڕیخۆلە، ئیفلیجی، زگ چوون .))، بۆیە پێویستە گرنگ بە لەش ساغی منداڵی یەك ساڵە بدرێت و فێری نەریتی خاوێنی بکرێت و پەیرەوی بە گەشەکردنی بدرێت. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((بایەخ دان بە پەروەردەی لەشی منداڵەکەت بدە هەر لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە، چونکە چۆن منداڵ بووبێت ئەوهاش پیاو دەبێتەوە.)) بەڵگەی ئەم ڕایەشی ئەوەیە: ((مێشکی ساغ لە لەشی ساغ دایە)). لەش و مێشکی ساغیش دەروون ساغی ئەنجام دەدەنەوەو لە لایەکی تریشەوە ئەگەر منداڵی یەك ساڵە بە ساغی و بەبێ تەگەرە ساڵەکەی بردە سەر ئەوە گەشەکردنێکی خێرا لە لەش و هۆشی‌دا روو دەدات و بەچاوێکی گەشبینیش تەماشای ژیان دەکات و بەدڵ و دەروونێکی قائم روو بە رووی ژیان دەوەستێت. بێگومان دایك و باوك و کەس و کاری منداڵەکە رۆڵێکی گرنگ بۆ دەست نیشان کردنی رووکاری کەسیەتی منداڵەکەیان دەبینن و بەختیاری دوا رۆژیشی کەوتۆتە سەر ئەستۆیانەوە. دەشێ منداڵێك بەرەسەنەوە زیرەك و لەندێشەی بە پیت بێت بەڵام بە لەش لاواز و کزو نابووت و خاوەو ناتوانێت بەرهەڵستی گەرداوی ژیان بکات و گۆشە گیرە و ناتوانێت رەوتی هەڤاڵەکانی لە یاری‌کردندا بکات، ئەم منداڵە بوویتە قوربانی نەفامی دایکی هەروەکو لەناو ژوورێکی هەوا نەگۆڕکێ و دوور لە مەرجەکانی تەندروستی دا بەندو بێبەری لە تیشکی خۆردا کردبێت، ئەم کارەشی بوویتە مایەی بێ بەش بوونی لە خوێی کالیسیۆم و ڤیتامین ((D))دا و لە ئەنجامی ئەمەشدا ئێسقانەکانی خاو وشلك و نەرم خولقاون، دایك کە ئەمەشی کردووە بە بیانووی ئەوە سەرمای نەبێت. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((دوای بوونی منداڵتان یەکسەر بۆ چۆلی بەرن بۆ ئەوەی لەناو باوەشی سروستدا بژێت و بەتیشکی رۆژ و ئاسمانی شین شادمان بێتەمە.)). کەچی ((زکیە عزیز)) دەڵێت: ((گرینۆکێ منداڵی تازە بوون و پشێوی خەوی لەشەودا بێزارکردنی دایك و باوکی بۆ هۆی کەم وەدەست کەوتنی گازی ئۆکسجین و تووش بوونی بە تەنگە هەناسە دەگەڕێتەوە.)). زانایانی ئەورووپا دەربارەی سودی زانستی رۆژ دەڵێن: ((تیشکی رۆژ خەوێکی

قول و هێمن به مەردوم دەبەخشێت و بەرگری لەش لە عاستی نەخۆشی‌یە درمی‌یەکان زیاد دەکات و یاریدەی ڕێکخستنی چالاکیەکانی مەردوم دەدات و ماسوولکەکانی پتەو دەکات و یاریدەی گەشەکردنی هۆش دەدات و مادده ژاراویەکانی لەش فرێ دەدات و پرۆسێسی سووڕانی خوێن ڕێك دەخات و سەر توێژی لەش ئارایشت و جوان دەکات.)). کەچی نووژدار ((بندیکتلس)) دەڵێت: ((چۆن ئاو بۆ ماسی پێویستە ئەوهاش تیشکی رۆژ بۆ ئادەمیزاد پێویستە.)). بۆیە پێویستە لەسەر دایك منداڵەکەی لە تیشکی رۆژدا بێبەری نەکات و هەموو رۆژێکیش گەڕانێکی بۆ ساز بکات تاکو بە تیشکی رۆژ تێنشیر بێت.)).

کارێکی نارەوایە دایك منداڵەکەی لەناو لانکدا بەند بکات و دەست و قاچەکانی بە دەسرازە شەتەگ بدات و لەشی بە جلکی قورسی جیاجیا بپەستێنێت و بیگوشێنێت، ئەم دایکە بزوتنەوەکانی منداڵەکەی بەربەست دەکات و بواریش بۆ پێگەیاندن و گەشەکردنی لەشی نادات و لە ئەنجامی ئەم کارەی دا دەشێ قاچەکانی خوار و خێچ برسکێن، لە لایەکی تریشەوە منداڵەکەی لەناو گۆمە نارەقێك مەلە دەکات و گیان و بەدەنی بێزار و جارزدەبن. زیاد بوونی شێ لەشی مایەی هەوکردنی بۆریچکەکانی هەناسەو پەیدا بوونی زیپکە لەسەرتوێژی لەش و تەگەرەخستن بەر پرۆسێسی هەناسە ئەنجام دەدات. ((ژان ژاك رۆسۆ)) رەخنە لە دایکان دەگرێت سەبارەت بە پەستانی لەشی منداڵیان بە جلکی قورس و داوایان لێدەکات لوولی نەدەن و نەی‌پێچنەوە، دەلیڤە بۆ جوجوڵ و بزوتنەوەی لەشی بەسەر بەستی و سەرفرازی‌یەوە بدەن. پزیشکی ئەمەریکی ((سۆمزی گۆدر)) دەڵێت: ((دوور نی‌یە کەللە ڕەقی مەردوم لە ژیانی‌دا بۆ مایەی پەستانی لەشی بە جلێکی قورس و گران هەر لەو دەمەی کە منداڵی ساوابووە بگەڕێتەوە.)). ئەگەر لەشی منداڵ بگوشرێت و بپەسترێت ئەوە هەست بە بێزاری و تەنگی دەکات و پەست و تووڕەش دەبێت، ئایا نا بینین چۆن یەکسەر لە گریان دەکەوێت و بەتایبەتی کە دایك دەسرازەی شڵ دەکاتەوە و دەست قاچەکانی دەبزوێنێت و بەرووخساری‌یەوە پێدەکەنێت و هەروەکو بڵێت: ((ئۆخەی لە کۆتەت دەرباز بووم؟)).

بۆ ئەوەی منداڵی یەك ساڵە بە ڕێبازێکی ڕاست پەروەردە بکرێت پێویستە بایەخ بە مانەی خوارەوە بدرێت:

### *یەکەم/ خواردەمەنی منداڵی یەك ساڵە:-*

باشترین خواردەمەنی منداڵی یەك ساڵە شیری دایکی‌یەتی، چونکە شیری دایك سوودێکی زۆر بە خۆی و بە دایکی دەبەخشێت، ئەو دەمەی منداڵی ساوا شیری دایك دەمژێت، ماسوولکەکانی دایك توند گرژ دەبنەوە، ئەم پرۆسێسەش یاریدەی گەڕانەوەی منداڵدانەکەی بۆ قەوارە و شوێنە سروشتی یەکەی دەدات وا بەدیارکەوتووە ئەو منداڵانەی شیری دایکیان

دەخۆنەوە کەمتر تووشی هەوکردنی ریخۆلە دەبـن، چونکـە شـیری دایـك پـاك و ئامـادەو بـێ گێچەلە، دایکی شیر دەریش بە مرۆڤایەتیيەکەی شادمانە بەتایبەتی دوای دوو هەفتەی یەکـەمی بوونی منداڵەکەی دایك هەست بە خۆشیەك دەکات بـۆ خـۆی نـاتوانێت سـنوری بـۆ دابنێـت وباسی بکات، هەسـتی مێینـەی بـەهێز دەبێتـەوە و ئاسـوودەیە چونکـە خزمـەتێکی بـەرز بـۆ مرۆڤایەتی پێشکەش دەکات، لە جیاتی ئەوەی بیر لە خۆیدا بکاتەوە بیر لـە خۆبـەخت کـردن لە پێناوی پارێزگاری چەشنی مرۆڤایەتیدا دەکاتەوە، دایکایەتی هەروەکو داری لیمۆیـە بەیـەك کات پەلك و گوڵ و بەر هەڵدەگرێت. پێشان ئافرەت لە ژاپۆن و چـین دا شـەش سـاڵ شـیری ئەدا بە منداڵەکەی کەچی لە هەرێمە ساردەکان هەروەکو ((ئەسکیمۆ)) دایك تـا منداڵەکـەی بگەیشتایە ((١٢)) ساڵ هەر شیری ئەداتێ، ئەگەر دایك شیر بە منداڵەکەی نەدات ئـەو دایکـە هەست ناکات کەوا دایکێکی راستەقینەیەو هەستیش بـە خۆشـەویسـتی قـووڵ بـۆ منداڵەکـەی ناکات ، هەست دەکات تەنیا هێناویەتی. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((ئەو دایکەی خـۆی لـە شیر پێداندا لابەلا بکات، ئەوە لـەیەکەم مـافی مرۆڤایـەتیدا حاشـا دەکاتـەوە.)). هـەر چـەندە دایك لـە فەرمانەکەیدا سەربکەوێت ئەوەندەش پـەیوەندی بـە منداڵەکـەی پتـەو دەبێـت هـەر دووکیانیش بەیەکتر شـادن و منداڵەکـەش فـێری خۆشەویسـتی بـۆ گشـت مرۆڤێـك دەبێـت.

دەروونناسان دەڵێن: ((خواردەمەنی سەرچاوەی گرنگی دانـی منداڵـە، رووکـاری بـۆ جیـهانی دەرەوە بەو خۆشیيەی لە میانی مەست کردنی پێویستیەکانی دا چێژاویەتی بەسـتراوە.)). واتـە ئەگەر هەست بە خۆشەویستی وسۆز و بەزەیيی دایکی لە کاتی شیر پێداندا بکـات ئـەوە بـە چاوێکی گەشبینی تەماشای ژیان دەکات و لەگەڵ ژیانی ئایندەیدا دەلوێت و لـەگـەڵ خـەڵکدا دەگونجێت. دەروناسان دەڵێن: ((ئەگەر دیکێك هەست بە خۆشەویستی و خامۆشـی لـە شـیر پێداندا نەکات، چونکە منداڵ تەنیا داوای شیر ناکات بەڵکو منـداڵ تامـەزرۆی خۆشەویسـتی و رەزامەندی و سینەی گەرم و هێمنی و سۆز و دابینــە. هـەروەکو ((شکسـپیر)) دەڵێـت: ((لـە جیهاندا سەرینێك نيیە نەرمتر بێت لە باوەشی دایك و گولێك نيیـە لـە دەمـی دایـك جوانـتر بێت.)). ((جۆن بۆلـب))ی ئینگلیزی بە دیاری خستووە کە خۆشەویستیی دایك بۆ منداڵەکەی لە میـانی سـاڵانی یەکـەمی تەمەنیيـەوە رۆڵێکـی گرنـگ بـۆ گەشـەکردنی لـەش و هـۆش و کەسـیەتیی دەبینێـت و دەپرژێتـە سـەر ژیـانی دوا رۆژی. خۆشەویسـتی دایـك ڤیتامینـــە بـۆ منداڵەکەی، چونکە بە خۆشەویستی دەروونی خامۆش و ویژدانـی هێمـن دەبنـەوە و پشـتی بـە خۆی دەبەستێت و بەبێ تـرس بەرهەڵسـتی ژیـان دەکـات و سـەردەکەوێت و بەخشـینی زۆر دەبێت و لەگەڵ خەڵکدا دەگونجێت، کەچی ئەو منداڵەی لـە خۆشەویسـتی بـێ بـەری بێـت، منداڵێکی نابووت و کز و مەلوول و دەروون ئاڵۆزاو و هـۆش دواکـەوتووە و لـە ژیـاندا بـێ بەهاو بەهرەیە و هەروا دەزانێت شتێکی بزرکردووە و کەسی خۆش نـاوێت چونکـە بزرکـەری

شت ئای بەخشێتەوە. کەواتە دایك یەکەم مامۆستاو یەکەم قوتابخانەی منداڵەکەیەتی هەروەکو ((بستالۆتزی)) وەتەنی.
شیری دایك پڕ لە توخمی خواردەمەنی چاك هەروەکو پرۆتین و ترشەلۆکی ئەمینی کە بەرگری بە منداڵ دەبەخشێت بە تایبەتی لە میانی مانگانەی یەکەمی تەمەنییەوە، لە ڕۆژانی یەکەمی شیر پێداندا شیرەکە شلێکی زەردباوی خەستە کە پڕە لە ڤیتامین و پرۆتین و گلۆبۆلیندا، لە دوای مانگی یەکەمی شیر پێداندا شیرەکە هەموو توخمەکانی خواردەمەنی تێدا دەبێت کە ڕۆڵێکی گرنگ بۆ گەشەکردنی خانەکانی مێشك و ئاسان کردنی کاری جگەرو سییەکان دەبینێت، لە ((فنلندا))دا لەوەتی ئەو دایکانەی شیری خۆیان بە منداڵیان دەدەن زۆربووین و نەخۆشییەکانی منداڵیش کەم



بوونەوە، کەواتە شیری سرووشت زۆر پێویستە بۆ منداڵ.

***چەند ئاگاداریەك بۆ دایکی شیر دەر:-***

(١)پێویستە لەسەر دایك بە ڕووخسارێکی گەشینی و زەردە خەنەوە پێشوازی منداڵەکەی بکات، ئەویش پێی شاد دەبێت و بەرەزامەندی وەڵامی دەداتەوە.

لێکۆڵینەوەیێکی نوێی دکتۆر ((ئەندرۆ ملتزۆف)) کە بەسەر (٤٠) منداڵیدا کردبوو، دیتی منداڵ هەر لە ڕۆژانی یەکەمی تەمەنییەوە بەدەربڕینەکانی ڕووخساری گەورانەوە دەزانێت و لاسایان دەکاتەوە، ناوبراو هەموو دەربڕینەکانی سەر ڕووخساری منداڵەکان لە سەر ڤیدیۆی تۆمار کرد، دیتی: ڕێژەیەکی زۆر لە منداڵەکان وەڵامی دەربڕینەکانی ڕووخساری گەوران دەدەن. کەچی ((ئارنۆلد جسل)) دەڵێت: ((باری دەروونی دایك کاردەکاتە سەر دەروونی منداڵەکەی، دایکی هێمن و بەسۆز خۆشمەند، منداڵەکەشی باش شیر دەخواتەوە و چاکیش خەوی لێدەکەوێت، کەچی دایکی نەسرەوت و پەست و غەمبار دەبێتە مایەی تێك چوونی نووستنی منداڵەکەی و ماندوێتی خەڵکی دەوروبەر.)). منداڵێك لە تەمەنی هەشت مانگان بوو، هەرچییەکی لەشیر و شلەمەنی دا بخواردایە دەی ڕشاندەوە، هەموو شێوازێکی چارە کردنی لەگەڵدا بەکارهێنرا دادی نەدا، یەکێك لە دەروونناسان دەروونی دایکی منداڵەکەی شیتەل کرد دیتی: دایکەکە دووچاری گرفتێکی دەروونی هاتووە و پەست و گرژی دایکەکە

درما بووەوە بۆ منداڵەکەی، کە دەروونی دایکەکە هێمن کرایەوە، ئەویش گەڕایەوە بۆ باری حاڵی. بۆیە ڕابەری دایکی ورووژاو دەکرێت شیر بە منداڵەکەی نەدات، چونکە لەشی ئەم دایکە بە غەم و پەژارە ئەسرەوتی ژاراوی بووەو ژەهرەکەش بە هۆی شیرەوە بۆ منداڵەکە دەچێت و تووشی زگ یەشەی دەکات، هەندێ جاریش ئەسرەوتی و گرژەیی دەروونی دایك دەبێتە مایەی دەرنەپەڕاندنی شیرەکەی. نوژدار ((سپۆك)) ڕابەری دایکی ماندوو دەکات شیر نەداتە منداڵەکەی تاکو لەشی خاو نەبێت و ماندووی لەحەسێتەوە. هەروەها پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان بە تایبەتی پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان بە تایبەتی پەیوەندی باش نێوان ژن و مێرد کاردەکاتە سەر دابین کردنی منداڵەکە، بۆیە دەبێ خۆشەویستی وریزلێگرتن و باوەڕی و دڵسۆزی دروشمی خێزان بن تاکو منداڵەکە هەر لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە فێری سۆزی مرۆڤایەتی بێت.



(۲) ئەگەر بە ناچاری دایك شیری دەست کردی دایە منداڵەکەی، پێویستە بیخاتە باوەشی‌یەوە تاکو بە سۆز و خۆشەویستی‌یەوە خامۆش و تێنشیربێت. بەلێکۆڵینەوە بەدیار کەوتووە کە ئەو منداڵانەی لە باوەشی دایکیاندا دوورن دووچاری پشێوی دەبنەوە. ((رینە. ا . سپیتز))ی دەروونناس بۆ ماوەیەکی درێژ لە دەزگای پەروەردە کردنی منداڵان لە ئەمەریکای خوارەوودا کاری کردووە. ((رینە)) دیتی: لە (۹۰) منداڵ کە لە ژێر ئاگاداریی دەزگایەکە بوون (۳۷)یان هەر لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یانەوە مردن و لە (۲۳ ٪)یان دووچاری کەمایەتی هۆش بوون. ((رینە)) دەڵێت: ((ئەوانە لە هیچیان کەم نەبوو، تەنیا دوورکەوتنیان لە باوەشی دایکیان نەبێت.)).
هەروەها دەبێ کەل وپەلی شیر خواردنەوە پێش و پاش بەکارهێنانیان پاك بکرێن و دایك نەهێڵێت مێش یان شتی تر پیسیان بکات، وا باشە لە شوێنێکی تایبەتی‌یان دابنێت، بە مەرجێ دەمی کراوە نەبێت.
(۳) تەنیا بەوەی کە دایك گۆی مەمك بخاتە دەمی منداڵەکە، دەشێ منداڵەکە بە ئاسانی شیری وە دەست نەکەوێت، لە ڕاستی‌دا شیر لە تێشووە لووەکانی سەر سینگدا پەیدا دەبێت پاشان بە دەزوولەی وورد بۆ ژمارەیێك لە گیرفاندا کە دەکەونە دەوروبەری پارچە ڕەشەکەی مەمك دەچێت و لەوێ کۆدەبێتەوە و بە بۆریچکەی وورد بەناو گۆی مەمك دەچێتە دەرەوە، ئەنجا دەبێ هەموو گۆی مەمك بخرێتە ناو دەمی منداڵەکە و لێوەکانیشی بەسەر پارچە ڕەشەکەدا یەك چین بکات وبی گووشێت تاکو شیرەکەی لێ‌بێتە دەرێ و بەئاسانی نۆشی بکات.

(٤) هەندێ منداڵ شیری خۆیان بە (١٠ ١٥) خوولەکە دەخۆنەوە، هەندێکیانیش بە هێواشی شیر دەخۆنەوە، ئەنجا پێویستە لەسەر دایك شیری بداتێ تاکو تێر دەبێت، خۆ ئەگەرهەردوو مەمکی بەتاڵ کردو بەردەوامیش بوو لەسەر مژیندا، با دایك لەم خۆشی‌یەدا بێ بەری نەکات، دەروونناسان دەڵێن: ((زۆر لە منداڵان کە پەنجەیان دەمژن، سەبارەت بەبێ بەری کردنیانە لە شیری دایکیاندا یان ئارەزوویان لە پرۆسێسی مژیندا تێر نەبووە.)).

(٥) واباشە دایك لە ژەمی بەیانی و نیوەڕۆدا دابنیشێت ئەنجا شیر بدات بە منداڵەکەی، سەبارەت بەوە دایك لەم دووکاتەدا خەواڵووە و دەشێ خەوی لێ‌بکەوێت و منداڵەکەشی لە تەنیشتی‌یەتی و دووریش نی‌یە بە سینگی یان بە بازووی هەناسەی سوار بکات ئەگەر پاڵی دابێت.

(٦)واباشە دایك لە میانی شیر پی‌داندا پشووبدات، تاکو منداڵەکە ئەو هەوایەی کە لەگەڵ شیردا قووتی دابوو دەری بهێنێت، بۆ ئەوەی ئەمەش بکات، پێویستە منداڵەکە بەرز بکاتەوە تاکو گەدەی هاو ئاستی شانی بکاتەوە و بە هێواشی لە پشتی بدات، دەشێ هەندێ شیر لەگەڵ هەوایەکەدا بچێتە دەرەوە ئەمەش جێی مەترسی نی‌یە.



(٧) دەبێ دایکی شیردەر جگەرە نەکێشێت و مەی نەخواتەوە، ژمارەیەکی زۆر لە شارەزاو پسپۆرەکانی فەرەنسادا لێکۆلینەوەیەکیان کرد دیتیان: ئەگەر بێتوو دایکی شیردەر ڕۆژێ ((٢٠)) جگەرە بکێشێت لە (٠,٤-٠,٥) مللی گرام ماددەی نیکۆتیندا دەچێتە ناو شیرەکەی، ئەمەش ڕەفتارێکی سامناکە بۆ منداڵەکەی، هەروەها ئامۆژگاری دایکی شیردەر دەکەن زۆر چاو قاوە نەخواتەوە.

(٨) دەبێ دایکی شیردەر خواردنی هاوکێشە بخوات و خواردنەکەی پڕ لە ڤیتامین و خوێی کالیسیۆم و فۆسفۆر و ئاسن و تووخمی بەکەڵکدا بێت، باشترین خواردەمەنی هێلکە و گۆشت و سەوزە ومیوە و بەرهەمەکانی شیرە، دەبێ دایکی شیردەر هەموو ڕۆژێك جارەکە گالۆنە شیرێك بخواتەوە، چونکە هەرچەند خواردنی بەکەلك بێت ئەوەندەش شیری زیاد و بەسوود دەبێتەوە.

### *دووەم/ نووستنی منداڵ:*

نووستن بۆ منداڵ زۆر پێویستە بە تایبەتی لە میانی مانگانی یەکەمی تەمەنی‌یەوە، چونکە لە تاوی گەشەکردنێکی خێرا دایە، منداڵی ساوا پێویستی بە (١٦) سەعات نووستنی هەیە، بەڵام دوای ئەم تاوە هێدی هێدی نووستنی کەم دەبێتەوە، منداڵ چاك دەخەوێت ئەگەر خواردنی ڕێك وپێك



وهێمن بێت و نەساغ و ئازاری نەبێت و هەوای سازگاری وەدەست کەوتبێت و پلەی گەرمایی و رادەی رووناکی ژوورەکە شیاو بێت، بۆ ئەوەی منداڵ چاك بخەوێت ئەم خاڵانەی خوارەوە دەخەینە بەرچاوی دیکان:-

١-دەبێ جلەکانی نووستن بە شێوەیەکی گشتی فراوان و پان و بەرین وخاوێن بن، جلەکانە ناوەوەشی نەرم و تەنك و لە لۆکە دروست کرابن، نەك لە ئاوریشم کە توانای مژینی ئارەقەی نییە، هەروەها دەبێ پەناو پێچ و قوپچەیان نەبێت.

٢-وەك ئاشکرایە مەردومی نووستوو بە هێواشی هەناسە وەردەگرێت، بەڵام هەناسەی درێژو قوولترە، بۆیە زیاتر پێویستی بە هەوای پاکە، ئەنجا دەبێ ژووری نووستن فراوان بێت و هەوا گۆرکێی هەبێت و تیشکی رۆژی لێ بدات.

٣-فسیۆلۆژیەکان دەڵێن: ((هەر لەرینەیێکی بە ئاواز کە لەدایکەوە دەربچێت کارێکی گرنگ دەکاتە سەر هێمن کردنەوەی رشتەی دەمارەکانی منداڵ)). هەندێ لە باپیرانیشمان دەڵێن: ((لای لایە دەکرێت بۆ ئەوەی منداڵ پێی بخەوێت وبحەسێتەوەو ئازاری لە بیر بچێتەوە، لە لاێکی تریشەوە منداڵەکە دەزانێت کە دەورووپشتی چۆل نییە و گرنگی پێدەدرێت و بە خامۆشی دەخەوێت. دایکی ژیریش منداڵەکەی لەم بەخشینەدا بێ بەری ناکات.

٤-واباشە منداڵ هەر لە دایك بوونییەوە لەناو ژوورێکی سەربەخۆدا بخەوێت، ئەگەر ئەمەش نەکرا پێویستە هەر لە تەمەنی شەش مانگییەوە لەناو ژوورێکی سەربەخۆدا بخەوێت تاکو بتوانێت بایەخ بە خۆی بدات و لەهەر شوێنێك بێت بەبێ ترس بخەوێت، نابێ بەهیچ جۆرێك رێی بدرێتێ لەناو یەك نووین لەگەڵ دایك و باوکیدا بخەوێت.

٥- شارەزاو پزیشکی ئەمەریکی ((هاڵ هاگنز)) دووپات دەکاتەوە و دەڵێت: ((نووستنی منداڵ لەسەر زگدا دەبێتە مایەی فەوتانی ددان و لاواز بوونی بەرگری و نارێکی رووەمەتییەوە، ئەویش دوای لێکۆلینەوەیەکی زۆری سەرئەوانەی کە تووشی نەخۆشی ددان هاتبوون بە دیاری خست: ئێسقانی منداڵ نەرم وشلن بە تایبەتی ئێسقانی کەللەی سەرو لەبەر ئەمە چل ئێسقانەی رووەمەت لەدوای هەموو ئێسقانەکانی لەش پتەو دەبن، بۆیە نووستنی منداڵ لە سەر زگییەوە دەبێتە مایەی خوارو خێچیان و تووش بوونی بە نەخۆشیی هەمە جۆرەی کونە لووت ئەنجا دەبێ منداڵ رابێت لەسەر پشتی بخەوێت.

٦-نێو بەناو نووینی منداڵ بەر تیشکی رۆژ بدرێت بۆ ئەوەی پاك بێتەوە وشێ یەکەی نەمێنێتەوە.

٧-پزیشك ((سپۆك)) دەڵێت: ((بۆ ئەوەی منداڵەكەت چاك بخەوێت پێویستە لەكاتێكی دیاریكراو بخرێتە ناو نووینی و بە رووخسارێكی گەشبینی مامەلەی لەگەڵ بكرێت و نەهێڵێت بترسێت.)). هەرچەندە دایك هێمن بێت، منداڵەكەشی بە هێمنی خەوی لێدەكەوێت.

## *سێیەم / بایەخ دان بە خاوێنی منداڵی یەك ساڵە:*

شتێكی ئاشكرایە خاوێنی مەردوم تەندروستی ساغ دێنێتە ئەنجام و مەدومەكە هەست بە خۆشی ورەحەتی دەكات و گورج و گۆڵەو بە چاوێكی گەشبینی تەماشای ژیان دەكاتەوە. دایكی خاوێن ورێك و پێك منداڵەكەشی خاوێن و رێك و پێكە، چۆن دار بێت، سێبەریشی وەها دەبێت. لە پێشەوە بایەخ بە جلكەكانی دەدات كە دەبێ لەو پەڕی سادە و خاوێن بن و بۆ پاراستنی لەسەرماو گەرمادا بلوێن و پان و بەرین بن بۆ ئەوەی بە ئاسانی منداڵەكە لەناویاندا بخەوێـەوە و بجولێت وببزوێت و یاخە و قۆلەكانیان فراوان بن تاكو بۆ لەبەركردن و داكەنینی خێرا شیاو بن. واباشە لە مانگانی یەكەمی تەمەنی‌یەوە، منداڵ لەكات ژمێری دەی بەیانی‌دا پێش ئەوەی ژەمە شیرەكەی بخوات گەرماو بكرێت، پێش دەست پێكردن بە گەرماو كردن دەبێ دایك هەموو پێویستی‌یەكانی ئامادەبكات هەروەكو سابوون كە دەبێ ماددەی ((ایكزا كلۆرۆفین))ی تێدابێت و پارچەیەك لە قوماشی خووری و پەشتەماڵ و هەندێ لۆكە بۆ ووشك كردنەوەی گوێ و كونە لووت، دەبێ پلەی گەرمایی ئاوەكەشی (٩٠ ١٠٠) پ ف بێت. لەگەرماوكردن دا پێویستە سەری منداڵەكەی بخاتە سەر قۆڵی دەستێكی و پەنجەكانی ئەم دەستەشی بخاتە بن كەوشی و بە دەستەكەی تریشی لەشی بشوات، ئەگەر بترسێت لەوەی منداڵەكە لە دەستی بكەوێتە خوارێ با لەسەر شتێكی دابنێت و سابوون لە لەشی بدات، ئەنجا بە هەردوو دەستی‌یەوە بیخاتە ناو حەوزی ئاو، پاش شووتنی دەبێ بەپەشتەماڵی نەرم لەشی بسرێت و كونە لووت و گوێی بە لۆكە، ئەنجا كەمێك بۆدرەی لێبدات، هەموو جۆرە بۆدرێك چاكە تەنها بۆدرەی هەوێنی زەنگ نەبێت، چونكە كار دەكاتە سەر سی‌یەكانی منداڵەكە. دیاردەیەكی نارەوایە دایك كەم بایەخ بە نینۆكی منداڵەكەی بدات، نینۆكیش كە درێژ بوو پڕ لە قرژو پیسایی دەبێت و منداڵیش لەم تەمەنەدا چالاكی یەكانی لە دەمی داین و پەنجەكانی دەمژێت و ئەم خۆرانەی لە ژێر نینۆكی داین تووشی نەخۆشی هەمە جۆرەی دەكەن و لە لایێكی تریشەوە دەستی بۆ دەم و چاوی درێژ دەكات و بە نینۆكە درێژەكانی برینداریان دەكات، بۆیە دەبێ دایك نەهێڵێت نینۆكەكانی درێژ بن و دەستەكانیشی خاوین بكاتەوە. كارێكی نا مرۆڤانەیە دایك منداڵەكەی فەرامۆش بكات و جلەكانی زوو نەگۆڕێت و هەموو رۆژێكیش لەشی نەشوات، چونكە منداڵ زۆر قەرسە بە پیسی بمێنێتەوەو نارەحەت دەبێت و خەوی لێناكەوێت و لەگریان ناكەوێت. دایكی هۆشمەند دەتوانێت چێژی جوانی لە لای

مداڵەکەی گەشەبکات، منداڵەکەشی وێڵـی جوانـی و شایستـەی رێـك وپێکـی و عـەودالّی ئارایشت دەبێـەوە هەیشە شانازی بە خۆی دەبات و پاك و خاوێنی و دیمەن قـۆزی لـە هـەموو کات و شوێنێك دا دروشمی دەبێت.
رێك و پێکی پاشەرۆکی منداڵ و بەجێ‌هێشتنی نەریتی منداڵانەو راهاتن سەر خاوێنی و فێربوونی نەریتی نایاب بە خۆرا نایێنە کایەوە، بەڵکو دایـك و بـاوك فـێری منداڵیـان دەیانکەنـەوە، هـەر فێربونێکیش تەواو نابێت و ناچەسپێت ئەگەر شارەزایی لـە تـەگیا نـەبێت و بـیرەوەری خۆشـی لەناو دەروونی فێرکەردا نەچێنین، بۆیە دەبێ دایك و باوك بە رێبازێکی دووربینی پشوو درێـژی و خۆراگرتنەوە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکەیان بکەن لە میانی فـێربوون و راهـاتن لەسـەر نـەریتی خاوێنیدا. منداڵەکەش بەپێی توانا و ئاستی خۆی حەز دەکات خۆی بـە خـاوێنی رابگرێـت و لەهەمان کاتیش دا رووکارێکی باش لە عاستی دەسـەڵات دا لـەناو دەروونـیدا دەخولقێنێـت کەچی مامەڵەی توندو تیژی دەبێـە مایەی یاخی بوون و کەم تەرخەمی منداڵەکە لـە خـاوێنیدا و گوێ نەدانی بۆ راو دەسەڵاتی گـەوران، ئەمـەش دەبێتـە مایـەی پشـێوی پـەیوەندی لەگـەڵ خەڵکدا و نەگونجانی لە ژیاندا و شێواندنی کەسیەتی. منداڵێك ((سەردار))ی ناو بوو، لاسار و چەپەڵ بوو و دان بە هەڵەکانی نەدەنا و دایك و باوك و مامۆستاکانی پەست و بـێزار کردبـوو، ((سـەردار)) کە منداڵی ساوا بوو بە زەبر و هەڕەشـە فـێری نـەریتی خـاوێنی کرابـوو، ئەمـەش کارێکی سەخت و گران بوو و لە ئاست و توانای بەرزتر بوو، بۆیە دڵ و دەروونی پڕ لە قینەی و رق بوو لە عاستی هەموو دەسەڵاتێکدا و زوێری و سەرکەشیی لێ‌دەکـات. دەشـێ مامەڵـەی توندو تیژی لە میانی فێرکردنی منداڵ نەریتی خاوێنیدا منداڵەکە لەسەر بایـەخدانێکی لـە رادە بەدەر بەشت و تۆژینەوە لە هەموو دوورو درێژی و ووردیێکدا رابهێنێت زیاتر لەوەی بایەخ بە نامانجەکانیان بـدات، واتـە ئـاخوولان و مـاخوولان لـە رەفتـار و هەڵسـوکەوتیدا هـەبێت.
دەروونناسان بەلێکۆلینەوە سەلمنادوویانە کە لە ((٨٠ ٪))ی بارەکانی نووین تەڕکردنی منداڵان بۆ ئالۆزی دەروونی دەگەڕێنـەوە. کـەچی نـوژدار ((مـارگریت جـیراد)) دەڵێـت: ((زۆربـەی بارەکانی نووین تەڕکردنی منداڵان بۆ نا هەمواری پەیوەندی نێوان دایك و منداڵی دەگەڕێتـەوە، هەروەکو دایك لۆمـەی بکـات و ئـەویش بترسـێت لـەوەی فەرامۆشـی بکـات، ترسـیش کـە بەسەریدا غالب بوو دەروونی دەهـەژێنێت و بـەبێ خۆویسـتی خـۆی تـەڕ دەکـات، هـەندێ جاریش خۆی تەڕ دەکات بۆ ئەوەی تۆلەی خۆی لە دایکـی بسـتێنێت بـە تایبـەتی ئەگـەر بـە توندی مامەلەی لەگەڵ کردبێت.)).

### *چوارەم / پاراستنی منداڵی یەك ساڵ لە نەخۆشی:*

بۆ ئەوەی منداڵ تووشی نەخۆشی نەبێت، کە تەمەنی بووە دوو مانگ پێویستە پێ‌کوتە لـە دژی ئیفلیجی منـداڵ بـەڕێگای دەمیـەوە بیدرێتـێ و پێ‌کوتـە لـە دژی وەنـاق و کۆکـە رەشـە و

دەردەکۆپان ((D.P.T))ی بدرێتێ و کەتەمەنی گەیشتە ساڵێك پێویستە لە دژی سووریژە بکوترێت و لەنێوان (١٢ ١٥) مانگی تەمەنیدا لە دژی خوریکە. پێویستە لەسەر دایك تۆمارگایێك بۆ ئەم نەخۆشانەی هەبێت و لە کاتی پێویستیدا پێشانی نوژداری بدات، نەوەکو بە هەڵە چەند جارێك منداڵەکەی بکوتێت، جاری واش هەبووە منداڵەکەی وامێکی قووڵ هاتووە، نوژدارێش بەبێ ئەم تۆمارگایە نەی توانیوە پێکوتە لە دژی ((دەردەکۆپان))ی بداتێ چونکە ئەم پێکوتەیە لە جارێك زیاتر نادرێتە منداڵ.

هەروەها منداڵ بە هۆی سەرماوە دەشێ دووچاری هەلامەت و هەوکردنی قورقوراگە و نەخۆشیەکانی سیی ببێت، منداڵەکە سەبارەت بە گیرانی کونە لووتی زۆر ئازار لە شیر خواردنەوەی دەچێژێت، بۆیە دەبێ دایك لە شوێنێکی گەرم بۆ ساردو پێچەوانەی ئەمەش نەیگوێزێتەوە و هەروەها دەبێ پلەی گەرمایی ژوورەکەی مام ناوەندی بێت و زۆریش ووشك نەبێت، پێکوتەی ((B.C.G)) لە دژی نەخۆشی سیل دەبێ فەراموش نەکرێت. لەو نەخۆشیە ترسناکانەی کە تووش منداڵ دەبن نە خۆشیی ((زگ چوون))ە بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا بلاودەبێتەوە، وا بەدیار کەوتووە نزیکەی ((٥٠٠)) ملیون منداڵ لە هەموو لایەکی جیهاندا تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن و بە ریژەی لە ((٤,١ ٪ - ٥ ٪))یان دەمرن، ئەم سەر ژماردنەش جێی مەترسیە، نوژداری فەرەنسی ((هنری لیتراوین)) ئاشکرای کردووە کە لە ((٨٠ ٪))ی هۆیەکانی ئەم نەخۆشیە بۆ ڤایرۆسێکی درمی کە ناوی ((رۆتا ڤیرۆس))ە دەگەڕێتەوە و لە وەرزی هاویندا گەشە دەکاتەوە، بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشیە ئەم چەند خالانەی خوارەوە دەخەینە بەرچاوی دایکان:-

١) بۆ ماوەی ((٤٨)) کاژێر شیر نەدرێتەنەخۆشەکە.

٢) زۆر ئاو بدرێتە نەخۆشەکە بۆ ئەوەی جێگای ئەم شلانەی کە لە بەری رۆیشتوون بگرێتەوە.

٣) بایەخ بە خاوێنی نەخۆشەکە بدرێت.

٤) بەپێی پەیامەکانی پزیشك ئاگاداری نە خۆشەکە بکرێت.

٥) هێمنی و حەسانەوە بۆ نەخۆشەکە ساز بکرێت.

٦) وا چاکە شۆربای برنج بدرێتە نەخۆشەکە، ئامادەکردنیشی بەم جۆرەیە:

((کەوچکێکی گەورەی برنج دەخەینە ناو دوو پەرداغی ئاو و تێکەلاوەکە دەخەینە سەر ئاگر تاکو دەنکەبرنجەکان ببنە نیشاستە و ووشینیان ئاسان بێت، ئەنجا تێکەلاوەکە بە پارچە قوماشێکی خاوێن و تەنك دەی پالێوین و برنجەکە بڕەك شەکر یان خوێی تێدەکەین و دەرخواردی نەخۆشەکەی دەدەین. ((صبری القبانی)) دەڵێت: ((ئەم کولاوە وەکو مەرهەمە بۆ هەو کردنی ریخۆڵە.)).

## گەشەکردنی لەشی منداڵی یەك ساڵە:

منداڵ هەر لە ساتی بوونییەوە بۆ شـان دان بـەر ژیـان ئامادەیـە، لـە رۆژی یەکەمـەوە کێشـی نزیکەی ((٣,٤)) کغم دەبێت و بەژنی نیو مەترە، لە پێشەوە رشتەی هەناسە دەسـت بـە ئیـش دەکات و سیەکان فراوان دەبنەوە بۆ وەرگرتنی گازی ئۆکسجین، بەڵام بۆچی لەگـەڵ هـاتنی بۆ ئەم جیهانە دەست بە گریان دەکات؟ هەندێ پیرە ژن دەڵێن: ((ئەم دنیایەی لا ناخۆشە)). لە راستیدا لە ئەنجامی پەرچەکرداری چوونی هەوا بۆ رشتەی هەناسەدا دەست بە گریان دەکات، لە زۆربەی بارو دۆخدا منداڵ بـۆ مـاوەی ((٢٤)) کـات ژمـێر خـەوی لێ دەکـەوێت چونکـە ماندووەو دەبێ بحەسێتەوە، دووریش نییە لـە کـاتی بوونـیدا ئـازاری کێشـا بێـت و نـەخۆش بکەوێت، دایکیش با نەشێوێت و دوای حەسانەوەی چاك دەبێت. لە سـاتی یەکەمـەوە رشـتەی هەرس و میزو سووڕانی خوێن دەست بە ئیش دەکەن و هەر لـە رۆژانـی یەکەمـەوە دەتوانێـت تەماشای شتی بریقەدار و رووناك بکات، پێش مانگی سێیەمی تەمەنییـەوە تـا دوو مـەتر شـت دەبینێت و یەك خوولەکەش تێی دەڕوانێت، کاتێ گلۆپێکی کارەبایی بـە توانـا ((٢٥)) وات و لە دووری ١٨٠ سم ئاراستەی چاوی منداڵێکـی هەشـت رۆژی کـرا، منداڵەکـە بـە خـێرایی پێڵوی چاوەکانی خستە سەریەك و کردنیەوە. منداڵ لـە کۆتـایی مـانگی دووەمـی تەمەنییـەوە هەست بە دەستەکانی دەکات و تا ماوەیێك تێیان دەڕوانێت و لە دەمی نزیکیان دەکاتەوە. لـە نێوان (٢-٤) مانگی تەمەنییەوە سەری بـۆ ئـەو دەنگانەکـە دەیـان بیسـتێت دەسـووڕێنێت و وەڵامی دەنگە ناسیاوەکان بە تایبەتی دەنگی دایکی دەداتەوە. هەر لە مانگی یەکەمییەوە گوێـی لە دەنگی بەرز دەبێت و لێی دەترسـێت، کـەچی هەسـتی تـامی منـداڵ لـە رۆژانـی یەکـەمی تەمەنییەوە رادە دارو لاوازە و متمانە بە هەستی بۆنکردنی دەکات.

هەستی بەرکەوتنی بەکارو زیندەکییە، بۆ ئەم مەبەسـتەیە ویسـتڕا شـانەی پـێی منداڵێـك کـە تەمەنی (٣٠) کات ژمێر بوو وریا بکرێتەوە، لـە پێشـەوە ڕەتـە کردارێـك لـە پەنجـەکانی پێـی رووی‌دا، واتە کرانەوە، هەندێ جاریش لنگی گرژ دەبووەوە، منداڵ ئەگەر لەسەر زگـی درێـژ کرایەوە یەکەمجار زەنقی بەرز دەکات و لە دوای دوو کـامگی تەمەنییـەوە دەتوانێـت سـینگی بەرز بکات و لەدوای مانگی سێیەمی تەمەنییەوە دەتوانێـت دابنیشـێت و لـە کۆتـایی مـانگی شەشەمی تەمەنییەوە بزووتنە پەرچە کردارەکانی کەم دەبنەوە و توانای گاگۆڵـەکردنی بـەدیار دەکەوێت و دەست وپێ و چاوەکانی بە خۆویست دەبزوێنێت، ئەوساکە پـەیتا پـەیتا دەیـەوێت بەسەر لەشیدا زاڵ بێت، بۆیە یاری بەشتی سادە دەکات هەروەکو کاغەزو ئاو هەروەکو دایکی دەستەکانی بۆ چاوی درێژ دەکات و دەیەوێت یارمەتی دایکی بۆ لەبەرکردن و داکەنینی جلەکانی بدات، ئەگەر دەست بۆ شتێکت بەرز کرد ئەویش ئەمە دەکـات، زۆربـەی منـداڵان هەردوو دەستیان بەکاردێنن، ئەمەش دیاردەیـەکی پەسـندە، ((ژان ژاك رۆسـۆ)) دەڵێـت: ((بـا

منداڵ هەردوو دەستی بەکاربێنێت و مەشقیان پێبکات تاکو پتەو ببنــەوە.)). منــداڵ لــە نێوانــی (٤-٦) مانگی تەمەنی‌یەوە دەیەوێت بگاتە شتەکان و بە دەستی‌یەوە بیان گرێت، لە پێشەوە بــە پەرچەکردار پەنجەکانی دەخاتە سەریان و توند دەیان گرێت، پاشان بە خۆویست ئەمە دەکــات. ئەوەی شایانی وتنە منــداڵ ئــارەزووی گرتنــی شــت و فــڕێ دانی‌یــەتی بــۆ ئــەوەی مەشــق بــە ماسوولکەکانی بکات، با دایکیش ئەوم ئارەزووەی ساردنەکاتەوە بەمەرجێ شــتی ژاراوی وتیــژ و تەلەگەزدار لەبەر دەستی‌دا لابەرێت. یاری بە شــتی ســووك وبچــووك دەکــات و بــەگرتن و فڕێ دان و دەنگی‌یــەوە شــادە، منــداڵ کەشــتێك بەدەســتی‌یەوە دەگرێــت، لەهــەمان کاتیشــدا دەیەوێت فێری فڕێدانی ببێت، ئەمەش دەکات بۆ ئەوەی کارامەیی‌یەکانی گەشە بکەن و شادی بخاتە دڵی‌یەوە، ئایا نــابینین کەشــتێك فــڕێ دەدات، چــۆن چەپڵــە لێدەدات و دەڵێــت: ((ئــێ. ئێ )). هەروەها بە گرتنی شتان فێری جیاوازی نێوان: سارد و گەرم، شــل و ڕەق، خــاو و توند، سووك و گران دەبێت. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((ئێمە بە هــۆی هەســتەکانمانەوە فــێر دەبین.)). بۆیە دەبێ کەل و پولی یاری کردنی بۆ ئامادە بکەین، بە مــەرجێ ئــەم خاڵانــە ڕەچــاو بکەین:-

(١)بۆیەکەیان نەچێتەوە و ماددەی قورقوشمیان تێدا نەبێت.

(٢)دەنگ و خشەیان لێبێت بەمەرجێ دەنگیان زۆر بەرز نە بێت، نوژداران دەڵێن: ((ئەگەر زۆر دەنگیان بەرز بوو، دەشێ منداڵەکە تووشی کەڕی هات، چونکە منداڵ زیاتر لە گەوران بۆ دەنگان هەستیارە.)).

(٣)ڕۆخەکانیان تیژ نەبن.



(٤)مەترسی لە تێکلیان نەکرێت، هەروەکو ئەوانەی کە لە ماددەی ((سلـلوید)) دروست کراون.

(٥)بــە هیــچ جۆرێــك ســەغڵەتی نەکــەن و نــەی وروژێنن. کە منداڵ فێری گاگۆڵە و ڕۆیشتن بوو لــە جوجۆڵدا ناکەوێت و سندووق و جانتا و چەکمەچە دەکاتەوەو شتەکانیان بە تاڵ دەکاتەوە و هەرشــتێکی کەوتە بەردەستی دەی بزوێنێت و دەیڕژێنێت و تــام و بۆنی دەکات، ئەوساکە پێویســتە لەســەر دایــك و باوك نــەهێلن لێیــان دوور بکەوێتــەوە و چــاودێری بکــەن و شــتی ترسناکیشــی لێ دوور بخەنەوە و دەبێ کەرەستەکانی یاریی بۆ کرانەوەو پێــوەدان و ڕاکێشــانی و پــاڵدان بشــێن. هەروەکو کورسی بچوك بۆ ئەوەی بەسەری دا بکەوێت و ڕای بکێشێت و شەش پــاڵووی

گەورە و هەمە قەبارە و تۆپ و سندووق، هەروەها دەبێ دایك و باوكیشی بەشداری یاریەكانی بكەن تاكو بە هاوڕێیەتیان شادمان هێمن بێت. هەروەكو ((ألن دیلۆن)) وەتەنی: ((باشترین میرات كە باوك بۆ منداڵەكانی بەجێدەهێڵێت ئەو چەند خولەكەی لە كاتەكانی‌یە كە لەگەڵ منداڵەكەی رایان دەبوێرێت.)).

## گەشەكردنی هۆشی منداڵی یەك ساڵە:-

((جۆن لۆك)) دەڵێت: ((هۆشی منداڵ زۆر بە تابلۆیەكی رەش دەچێت، دەتوانین بە ئارەزووی خۆت شتی لەسەردا بنوسیت.)). لە ساڵی ١٨٩١ دا ((ولیم جیمس)) لە ناو پەرتووكەكەی ((مبادیء علم النفس))دا دەڵێت: ((كە منداڵ لە دایك دەبێت دوو چاو و دوو گوێ و كونە لووت و ریخۆڵەی هەیە، بەڵام بە پشێوی و واق ورمانەوە تەماشای دەورو بەری دەكات.)). هەتاكو ساڵی ١٩٨٤ بە قوتابیانی زانكۆیەكان راگەیاندرا گوایە منداڵی تازە بوون ناتوانێت چاوەكانی بچەسپێنێت یاخوت وەڵامی دەنگەكان بدات، واتە وریا بوونەوەی نی‌یە، بەڵام دوایی لێكۆلینەوەكان كە بەسەر منداڵدا كران ئەم رایانە جێی گومانی. لەناو یەك لە ژوورەكانی خەستەخانەی ((بۆدیلۆك))ی فەرەنسیدا پەرستارێك منداڵێكی چوار رۆژی دەخاتە ناو لانك و كۆمپیوتەرێكی پێ دەبەستێت و شووشە شیرێكی بە تالیش بە كۆمپیوتەرەكە دەبەستێت، مەبەست لەم تاقیكردنەوەیەش ئەوەیە چۆن منداڵی ساوا دەنگ دەناسێت؟ پەرستارەكە شووشە شیرەكە دەخاتە دەمی‌یەوە، تۆمارگاكەش بەدەنگی پیاوێك ئەم دەنگانە ((بی، سی، می، سی، می، سی، بی، سی، می)) دووبارە دەكاتەوە،منداڵەكە شووشەكە دەگرێت، هەركە دەنگێكی نوێ دەبیستێت،مەمەكە دەمژێت ودڵی زیاتر لێدەدات، بەڵام كە دەنگەكانی ناسینەوە، پەیرەودانی بۆ مژین سارد دەبێتەوە، كۆمپوتەرەكە مژینێك لە خولەكەیكدا تۆمار دەكات، كە بەكتوپڕی برگەی ((دا)) لە تۆمارگاكەدا دەردەپەڕی، دووبارە منداڵەكە بە توندی مەمەكە دەمژێت، لە بۆی ئاشكرا بوو شیری تێدا نی‌یە دەستی بەگریانكرد، پەرستارەكە شیر دەخاتە ناو شووشەكەی و منداڵەكەش هێمن دەبێتەوە.

منداڵێكی تازە بوون چی دەزانێت؟ هەموو ئەو تاقیكردنەوانەی كە لە گێتیدا بەسەر منداڵدا دەكرێت، ئەوە دەگەێنن منداڵەكان زیاتر لە بۆچونەكانی زانایەكان دەزانن،منداڵان قسە ناكەن و نازانن راڤەی ئەوەی دەیبینن وبیری لێدەكەن بكەن، بەهۆی پێش كەوتنی تەكنۆلۆژیاوە تاقیكردنەوەكانی سەر منداڵ زۆر شتیان ئاشكرا كرد كە پێش (١٠) ساڵ لەمەوبەر بە خەیاڵمان نەدەهات، نوژداران توانیان كامیرای ڤیدیۆ بۆ تۆماركردنی دەنگەكانی منداڵی ساوا بەكاربێنن و بیسەلمێنن كە ئەم دەنگانە لەگەڵ شەپۆلەكانی دەنگی دایك دەگونجێن. پرۆفیسۆر ((ایماس)) دەڵێت: ((منداڵ هەر لە هەفتانی یەكەمی تەمەنی‌یەوە توانای جیاكردنەوە نێوان قسە و

دەنگەکانی هەیە، قەت ئەم یستووە منداڵێکی ساوا لاسای دەنگــی ئۆتۆمبێـل بـۆ نمونـە بکـات، منداڵ بە هەموو توانای دەیەوێت فێری زمان ببێت بەڵام مێشکی منداڵ دەست بە ئیـش دەکـات پێش ئەوەی کەرەستەی زمانی هەبێت.)) منداڵی ساوا لاسای دەربڕینەکانی رووخساری دایکـی دەکات ((اولفا مارانۆس)) قوتابی‌یەکی یۆنانی بوو، تاقی‌کردنەوەکانی بەسەر منداڵێکـی ساوادا دەکرد کە لە هەفتەی حەوتەمدا بوو بۆ ئەوەی فێرنامــەی دکتـۆرای پی‌وەربگرێـت، لـە سـاڵی ١٩٧٣ چووە ماڵی دکتۆر ((جین بیاجیت)) و پێی‌وت: ((کە من زمانم بـۆ منداڵەکـە دەرهێنـا، منداڵەکەش دەست بەجێ زمانی بۆ دەرهێنام رات لەمە چی‌یە؟)). دکتۆری ناوبراویش پی‌کـەنی و لە وەڵامدا ووتی: ((منداڵێکی کەم رەوشتە)). ئەو تاقیکردنەوانەی لە میـانی بیسـت سـاڵەی دوایی‌دا سەلماندوویانە کە منداڵی ساوا هۆشی هەیە هــەتاکو ئەگـەر زمـانیش نـەزانێت. زانـای دەروونی پرۆفیسۆر ((الیزابێت سیلك)) بە تاقیکردنەوە بە دیاری خست کە منـداڵان دەتوانـن شارەزایی خۆیان بۆ کۆمەڵەکان رێك بخەن و هەردەم و بەردەوامیش کارامەیی نوێ دەدۆزنەوە. (بریر)) دەڵێت: ((قسەو دواندنی خەڵکی دەوروبــەر کـار دەکەنـە سـەر دەنگـەکانی منـداڵ دەیەوێت لێیان بگات و بیان بێژێت، ئەمەش بە ماوەیەکی کورت روو نادات.)). کـەچی ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((منداڵ بە لاساکردنەوەو مامەڵە کردنی لە گەڵی‌دا فێری زمانی دایـك و باوکی دەبێت.)). لە سەرەتای هەفتەی پانزەمی تەمەنی‌یەوە منداڵ هــەندێ دەنـگ بـە چـالاکی یەکی زۆر دووبارە دەکات بە تایبەتی لــە کـات ژمـێری شەشـی بـەیانی‌دا، نـوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((منداڵ کە بۆ یەکەمجار دەنگی لێ‌دێتــە دەرێ، هەسـت بەخۆشـی‌یەکی زۆر دەکـات و سەدای دەنگی خۆی دەبێت و دەیەوێت چەند جارێك هەمان دەنگ دووبارە بکــات و هەرکـە بەسەریدا زاڵ بوو دەکەوێتە وێژەی دەنگی تر.)). لە مانگی چوارەمــدا دەنگـی پیتـی ((ك، غ)) دووبارە دەکات بۆ ئەوەی ئەندامانی بێژاندنی رابهێنێت و پیتێکی ئاسان لەوشەیەك جەبێژێت بـۆ دابینکردنی پێویستی‌یەکانی هەروەکو بلێت: ((م، م، ..)) مەبەستی شیر خواردنەوە بێت. ئەو ساکە ووشەیەك لە دوو بڕگەی وەکو یەك پێکهاتبێت هەروەکو ((بابا، مامــا، دادا، نەنـە)) دەبێژێت. بە لاساکردنەوەی‌و تی‌کەڵاو بوون و مامەڵەکردن پەیتا پەیتا دەستکەوتی زمـانی زیـاد دەبێت و ئەندامانی خـێزانیش رۆڵێکـی گرنـگ بـۆ فـێربوونی منـداڵ دەبینـن، ئـەو منداڵانـەی لەباوەشی خێزاندا دوورن توانای فێربوونی زمانیــان کـەمترە لــەو منداڵانـەی کـە بـە باوەشـی خێزانەوە تێنشیرنز هەموو منداڵێك بۆ خۆی بڕیاری چۆنیەتی فێربوونی زمان دەداتن نە هەرەشــە و نەخۆ هەڵ قووڕتاندن لە کاروباری منداڵدا فێری زمانی دەکەن. بەڵکو بە خامۆشی و هێمنـی و ئۆقرەیی و دواندنی زۆر لەگەڵی‌دا فێری زمان دەبێت، هەروەها پێویســتە بـواری بدەینـیێ بـۆ توێژینەوەو تاقیکردنەوەی بۆلی‌دوان و قسەکردن و گەڕان هانی بدەین و نابێ و ناشبێ بــە هیـچ

جۆرێك تەریقی بکەینەوە ئەگەر هەڵەی کرد، کە منداڵ یاری بە شتان دەکات لە هەمان کاتیش دا ناویان لێدەنێت و دەست کەوتی زمانیشی زیاد دەبێت و گرێی زمانی دەکرێتەوە چونکە بە رەوانی لەگەڵ لەیستۆکەکانیدا دەدوێت، بۆیە دەبێ دەرفەتی بدەینێ یاری بکات. زمان باریدەی گەشەکردنی هۆش دەدات و رادەی زیرەکی منداڵ بەدیار دەخات، هەر بە هۆی زمانەوە خۆی تێکەڵ بە خەڵك دەکات و ژیانداریی شیاوی وە دەست دەکەوێت و بازنەی شارەزایی فراوان دەبێتەوەز

## *گەشەکردنی دەروونی منداڵی یەك ساڵە:*

((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((منداڵ لە قۆناغی یەکەمی تەمەنییەوە گیان لە بەرێکی لاوازە و ناتوانێت لە خۆیدا دەرببڕێت تەنیا بە قیژاندن و گریانەوە نەبێت، هەست دەکات پێویستی بە شتێکە و ناتوانێت زامنی بکاتن ئەوساکە دەقیژێنێت هەرکە پێویستییەکەی جێبەجێکرا هێمن دەبێتەوە، بەم گریانە پەیوەندی بە شوێنەوری خۆی دەبەستێت.)). کە چی خاتوون ((هۆنی)) دەڵێت: ((منداڵ کە خۆی بەتەنیا دیت هەست بە لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆی دەکات و دەقیژێنێت، هەر سەبارەت بەمەیە نایەوێت بخەوێت، چونکە نووستن لەلای دا تەنیایی دەگەیێنێت.)). قیژاندنی منداڵ جۆرێکە لە هەڵچووندا، لە هەمان کاتیشدا هەست بە رەزامەندی دەکاتەوە کە تێر بوو یان رەحەت بوو و ئازاری نەما، ئەم رەزامەندییەش بە زەردەخەنەی قەشەنگەوە دەردەبڕێت، کەواتە هەڵچوونەکانی منداڵی ساوا بە خواست پێویستییەکانی بەستراونن لە پێشەوە دوو هەڵچوون کاری تێ دەکەن، هەڵچوونی نارەحەتی لە ئەنجامی برسێتی و ئازاری دا و هەڵچوونی هێمنی لە ئەنجامی تێر بوون و نەمانی ئازاریدا، دایکی هۆشمەندیش دریغی لە جێبەجێکردنی پێویستییەکانی دا ناکات بۆ ئەوەی هێمن و خامۆش بێت و پەیوەندی پتەو لەگەڵیدا ببەستێت و لە دواییدا لەگەڵ خەڵکدا بگونجێت، بە هۆی خۆراکەوە درندەترین گیانەوەر دەسەمۆ و رام دەبێتن منداڵیش بێ ئەمەك نییە چاکەی دایکی لەیاد ناکات و خۆشی دەوێت. منداڵ هەر لە مانگی یەکەمی تەمەنییەوە لە دەنگی کتوپڕ دەترسێت هەڵچوونی ترسیش کاردەکاتە سەر ویژدانی منداڵ بەم سێ هەڵچوونانە و تێ کەڵ بوونی بە کۆنگەتی ژیان کۆمەڵێك هەڵچوون لەناو دەروونیدا گڵ دەبنەوە و رووکاری بۆ ژیانی چ بە خۆشی و چ بە ناخۆشی دەست نیشان دەکەنەوە نیشانەکانی خۆشمەندی هەر لە تەمەنێکی زووەوەی بەدیار دەکەوێت، بۆ نمونە کە شەق شەقەکەی بۆ خۆی دەهەژێنێت هەست بە خۆشی دەکات و هەروا دەزانێت دەنگێکی رسکاندووە، ئەگەر لە دەستییەوە بکەوێتە خوارێ تەماشای دایکی دەکات و هەروەکو بپارێتەوە تاکو بۆی بهێنێتن ئەمەش دەکات بۆ

ئەوەی خۆی تاقیبکاتەوە، ئـاخۆ دەتوانێـت دووبـارە ئـەم دەنگەیـە بڕسـکێنێت، هەسـتیش بـە ڕەزامەندی لە عاستی مامەڵەی باشی دایکییەوە دەکات.

چۆن سۆز لەناو دەروونی منداڵدا دەرسکێت؟ دایکی هۆزان ئەگەر منداڵەکەی بگرتێ بە هـۆی گریانەکەی دەزانێت، ئەگەر برسی بوو زوو بە زوو شیری دەداتێ و هێمنی دەکات، ئەگـەر بـە هۆی نارەحەتی بێت بە خێرایی خامۆشی دەکات، ئەگەر نەساغ بکەوێت هەروەکو پەپولـە بـە دەوریدا دەسوڕێت و چارەی دەکات. پسپۆڕێك بـە کاروبـاری منـداڵان دەڵێـت: ((پێویسـتە لەسەر دایك زوو وەڵامی گریانی منداڵەکەی بدات، چونکە ئـەم وەڵام دانـەوە لـە منداڵەکـە دەکات کە هەست بکات کە مەردومێك لە نزیکییەوە و دەیبیسێت و بایەخی پـێدەدات، ئـەم هەستەشی وای لێدەکات کە شوێنەوار کاری تێبکـات و هێمـن بێـت و زوو وەڵامـی سـۆزی دایکی بدات، ئەمەش هـانی دەدات بـۆ فـێربوونی زمان و گوێ ڕاگرتن بۆ ڕابەرەکانی شوێنەوار.)).



کەچی ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((زوو وەڵامی گریانی منداڵەکەت بدە، نەوەکو فێری گریانی بـە هـۆ وبـێ هـۆش بێتـەوە و ببێتـە جـەلادی مـاڵ بەمەبەسـتی تۆڵـە سـەندن لـە عاسـتی فـەرامۆش کردنـیدا.)). دایکـی ژیـر زۆر بایـەخ بـە پێویستەسروشتییەکانی منداڵەکەی دەدات و لـە سۆزو خۆشەویستی بێ بەری ناکات، منداڵەکەش لەناو باوەشی خێزاندا خامۆش دەبێـت و دەروونـی گەشـە دەکـات و لـە ژیـانیدا هاوسـەنگ دەبێت. منداڵ بە ڕێبازی پەروەردەی ڕاست فێری خۆشەویستی و سـۆزی مرۆڤایـەتی و بـەزەیی دەبێت، ئایا پیاوانی پیرۆز لەناو باوەشی خێزان دا هەڵناکەون کە خۆشەویسـتی دروشـمی بێـت؟ ((ولیـم جیمـس)) دەڵێـت: ((خۆشەویسـتی سـیفەتێکی درمییـە لـە گەورانـەوە بـۆ منـداڵ دەگوێزرێتەوە.)). خۆشەویستی دایك بۆ منداڵەکەی ڤیتامینی دەروونە، ئەگەر منداڵ هەست بـە خۆشەویستی بکات، هێمن دەبێتەوە، سەردەکەوێت، سەرکەوتنیشی باوەر بە خۆ پتـەو دەکـات و پـەیوەندیی باشـیش لەگـەڵ خـەڵکدا دەبەسـتێت و خۆشـی دەوێـن و خۆشـیان دەوێـت و ویژدانیشی گەشە دەکات، ئەمەش ئاواتی هەموو پەروەردەیێکە. دکتۆر ((ستانلی کۆبرسمیث)) مامۆستای زانستی دەروون لە زانکۆی ((کالیفۆرنیـا))دا لێکۆلینەوەیـەکی بەسـەر ((١٧٤٨)) منداڵ و خێزانیدا کرد دیتی: (٣) هۆ دەبنە مایەی بە هاندانی منداڵان:

١-ئەو منداڵانەی لە لای دایك و باوکیان خۆشەویستن و بایەخیان پێدەدرێت.

٢-دایك و باوکیان لەسەر ڕۆشنایی پەروەردەیێکی ڕاستدا هەڵسوکەوت دەکەن.

٣-لەناو خێزانێکدا دەژیان کە راست گۆیی و دیموکراسیەت دروشمی بوو.
دایکی گەمژەڵ ئاورِ لە گریانی منداڵەکەی نادات و پێویستی‌یەکانی فەرامۆش دەکات و سۆز وخۆشەویستی دایکایەتی بۆ نانوێنێت، ئەمانەش هەمووی دەبنە مایەی گریانی بە هۆ و بیّ هۆی منداڵەکە ورسکاندنی رقەبەری نێوان منداڵ و دایك، منداڵ دەیەوێت دەسەڵاتی بە سەری‌دا بسەپێنێت، ئەوەش لەیاد نەکەین رووکار سەرپێچی هەر لە کاتێکی زووەوە لەلای منداڵ بەدیار دەکەوێت، ئەنجا چ بە وێنەی مانگرتن لە شیر خواردندا، یان پەلوپۆی رەق دەکات و نایەوێت بخەوێت، هەندیّ جار دەقیژێنێت تاکو هەناسەی کز دەبێت، هەندیّ جاریش گرفتە دەروونی‌یەکەی بە رشانەوە دەردەبرێت، دایکی دڵ رەقیش زیاتر دەی وروژێنێت و ئاگری تۆڵە سەندن لەناو دەروونی‌دا دادەگیرسێنێت و فێری رووهەڵ ماڵراوی و نەسەلمێن و سەرکەشی و سەر پێچی نەك لە عاستی بەڵکو لە عاستی هەموو دەسەڵاتێکدا دەکات، ئەمەش دەبێتە مایەی شێواندنی کەسیەتی و پەیوەندیی لە گەڵ خەڵکداو نەگونجانی لە ژیان و لەگەڵ خۆی‌دا. ((بایرۆن اجیلاند)) مامۆستای زانستی دەروون لە زانکۆی ((میشابۆلیس))دا دەڵێت: ((کاری زامکردنی هەستی منداڵ لە ئازاری لەشی‌دا کەمتر نی‌یە.)). لیّ‌کۆڵینەوەکانی ((اجیلاند)) و هاوریّ‌یانی بە دیاریان خست ئەو منداڵانەی هەستیان زام دەکرێت دووچاری پشێوی هۆشی و دەروونی زیاتر لەو منداڵانەی کە دووچاری ئازاری لەشی دەبنەوە. دکتۆر ((جای لیفر)) دەروونناسی شاری ((نیۆیۆرك)) دەڵێت: ((بیّ بەری بوون و فەرامۆش کردن و کەم کردنی بە هاو ورکێفی توند ئەم چوارانە هەستی منداڵ زام دەکەن.)). کەچی ((زینب النجار)) دەڵێت: ((دامرکان و بەربەستکردن و ترساندن پاڵ بە منداڵ دەنێن بۆ گۆشەگیری.)).
بۆیە دەبیّ مامەڵەیێکی نەرم و هێمنی لەگەڵ منداڵی یەك ساڵەدا بکەین تاکو لە ژێر سێبەری دایك و باوکی‌دا بحەوێتەوەو ویژدانی هێمن و دڵنیا بێتەوە و بە چاوێکی گەشبینی تەماشای چیان بکاتەوە و هەست بکات کە دایك و باوکی دەیپارێزن و ئاوڕی لیّ‌دەدەنەوە. ((ولیم هنری)) دەڵێت: ((هەموومان دەیەوێت هەست بکات کەسەر بە کۆمەڵێکە و ئەندامە لەناو کۆمەڵێکدا.)). ئەنجا چۆن منداڵی یەك ساڵە حەز ناکات پشتی بگیرێت و دابین بکرێت؟. منداڵ هەر لە ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە ویژدانی دادەمەزرێت و لەسەر رۆشنایی رێبازی پەروەردەی‌دا جێگیر دەبێتەوە.

## بەندی چوارەم
## ((پەروەردەی منداڵ لە ساڵی دووەمی تەمەنییەوە))

گەشەکردنی لەشی منداڵی دوو ساڵە هێدی دەبێتەوە، بەڵام پەیتا پەیتا دەتوانێت بەسەر ماسوولکەکانیدا زاڵ بێت و بە شێوەیکی گشتی هاوسەنگی بزووتنەوەیان بکاتەوە. بە پێی لێکۆڵینەوەی ((جیزل)) لە پێشەوە ئەندامە گەورەکان کارامە دەبنەوە، پاشان ئەندامە بچووکەکان، واتە پەنجەی گەورەزووتربەکاردێنێت. منداڵی دوو ساڵە ئارەزووی لاساکردنەوەی گەورانی هەیە و بەدوای دایك و باوکی دەکەوێت و بەپێی توانای هەرکارێکیان کرد لاسایان دەکاتەوە، کوڕ دەیەوێت هەروەکو باوکی هەڵسوکەوت بکات، دووریش نییە وەکو ئەو ریشی بتاشێت و لەبەر ئەفامی خۆی لە خوێن بگەوزێنێت، کچیش دەیەوێت هەروەکو دایکی ماڵ بە خاوێنی



رابگرێت، منداڵی دوو ساڵە دەست بە پشکنین و تاقیکردنەوە و تێڕوانین و تێك دانی شت دەکات، ئەگەر بە ئارەزووی خۆی بگەڕێت و بسوڕێت و بپشکنێت و دایك ئاگای لێنەبێت دەشێ زیان بە خۆی و بەماڵ بگەێنێت، هەتاکو شارەزایانی پەروەردە ساڵی دووەم لە تەمەنییەوە بە ساڵی ژاراوی لە قەڵەم دەدەن. کە منداڵ چاوی بە سەعاتی باوکی دەکەوێت، هەڵی دەگرێت، تێی دەڕوانێت، وەری دەگێڕێت، بەڵام هێشتا خواستەکەی نەهاتۆتە جێ، دەیەوێت هەڵی وەشێنێت بۆی ناکرێت، بەنجا فڕێی دەدات و دەشکێت و دەست بەسەرنجدان وتێڕوانینی دەکات هەتاکو ئارەزووی تێر دەبێت، باوکیش نازانێت خواستەی، بەس ئەوەندە دەزانێت سەعاتە بەنرخەکەی شکاندووە و سزای دەدات،منداڵەکەش هەروا دەزانێت هیچ تاوانێکی نەبووە. ((ایلین کلارك)) دەڵێت: ((منداڵ زۆر خۆشی لە تێك دان و شکاندنی و هەڵ وەشاندنی دەچێژێت، بۆیە دەبێ کەل وپەلە یاریەکانی بۆ ئەم خواستەی بشێن نەوەکو بکەوێتە وێزەی کەل و پەلی ماڵ و ئارەزووی خۆی پێیان تێر بکات.)). منداڵی دوو ساڵە گیانی پڕە لە چالاکی و نایابی و جموجوڵیدا، بۆیە دەبێ دەرفەتی بدەینێ تاکو بۆ خۆی شارەزای دەووروبەری بێت و لەگەڵیدا بگونجێت و ژیانداری وە دەست بکەوێت. منداڵی دوو ساڵ حەز لە خشاندن سەرشتی لووس و چەماوەدا دەکات و خۆی سەر تابلۆی دارێك هاوسەنگ دەکاتەوە و لەقوڕیدەستکردەو ئەندێشەی

خۆیدا چەند پەیکەرێك دروست دەکات. بووکە شووشە و سندووقی شەش پالوو و قوری دەست کردە و کاغەزو ئۆتۆمبیل و کورسی بچووك لە کەل و پەلە یاریەکانی دان. منداڵ بە چالاکیەکانی هەڵدەستێت بۆ ئەوەی کارامەیی وە دەستی بکەوێت و شارەزایی فراوان بێت و ماسولکەکانی پتەوو بە هێز بکات و دەوروبەری خۆی بناسێت، بۆیە پێویستە لەسەر دایك چاوەدێری بکات و دەرفەتی بداتێ بۆ خۆی هەڵەکانی چاك بکات، هەرچەندەکی سەربەستی پێ بەخشی زیاتر دەتوانێت شوێنی خۆی لەناو ماڵدا بزانێت و چ لە دەوروبەریدا روو دەدات؟ کەچی ئەگەر منداڵێك سەربەستی پێ نە بەخشرا ناتوانێت شارەزای دەوروبەری ببێت و متمانە بە خەڵك بکات و هەڵسوکەوتەکانیشی بە خۆپەرستی و بێ گرنگ دان دەمۆرکێن، با قەد دایك نەڵێت تۆ ناتوانیت ئەمە بکەیت، بەڵکو هانی بدات کە دەتوانێت و خۆی تاقیبکات و ئازایەتی منداڵەکەی نەفەوتێنێت.



منداڵی دوو ساڵە حەز دەکات بە ئاو یاری بکات و دەیەوێت ئاوەکە بگرێت و پێی ناگیرێت و دەکەوێتە سەیر و سەمەرەی، لە هەمان کاتیش دا لەگەڵ تەنی رەق دا بەراوردی دەکات، منداڵێك ئاوی دەخستە قاپێك، پاشان ئاوەکەی دەرێژت، دیتی ئاوەکە دەپرژایەوە، ئەنجا هەمان قاپ پر لە قومەکەی دەرێژت، دیتی بە وێنەی قالب دەرئەچوو، ئەوساکە لە دایکی پرسی: بۆچی ئاو پەرت دەبێت و قومیش کۆ دەبێت؟ ئەمەش پرسیارێکی گرنگە بۆ مەبەستی جیاوازی نێوان تەنی شل و تەنی رەق. بۆ هەمان مەبەست زوو بۆ گەرماو غاردەدات، واباشە بووکە شووشەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات و دایکیش دەرفەتی بداتێ بیشوات و یاری بە ئاو بکات بۆ ئەوەی شارەزایی خۆشبینی لە گەرماودا وە دەستی بکەوێت، بەڵام بۆچی هەندێ منداڵ درنەدا دەگرن و بۆ گەرماو ناچن؟ بێ گومان ئەمانە شارەزایی ناخۆشیان وە دەست کەوتووە، هەر وەکو بە هەڕەشە و زەبر بۆ گەرماو وەرگیرابن، یان ئاوەکە زۆر گەرم بووە، یان کەفی سابوون چووێتە نا وگوێ و چاویان و نایانەوێت هەمان تاقیکردنەوەیان دووبارە بکرێتەوە.

شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ((ئەگەر بتەوێت منداڵت فێر ببێت، بیرەوەرو شارەزایی دڵروونی بچێتە ناو دەروونی لە میانی پرۆسێسی فێربووندا.)).

دەشێ منداڵی دوو ساڵە چالاکی یەکانی بە هەموو تێکۆشانێك و هەنگاوی فراوان بکات و دەشێ لە میانییان هەڵە بکات و بکەوێت و ئازار بکێشێت، با دایك و باوك نەی شێوێنن و

لێی نەترسێن و شەرمەزاری نەکەن بەڵکو بۆ ئەرك کێشان و ئازایەتی و جوامێری و نایابی هانی بدەن بۆ ئەوەی پشتی بە خۆی ببەستێت و بە توانای خۆی ڕاپەڕمووێت و باوەڕی بە خۆی بچەسپێت و لە ئەنجامدا فێری پشوو درێژی و ئۆقرەیی و ئارامی بێت و بتوانێت بەرهەڵستی ژیان بکات و سەربەستی خۆی زامن بکات و فێر ببێت چۆن خزمەتی خۆی بکات و چارەسازی گیروگرفتەکانی بکات. منداڵ هەر شتێکی کەوتە بەردەستی دەیەوێت تێی بروانێت و بزانێت چی‌یە؟ ئەنجا پێویستە لەسەر دایك و باوك شتی ترسناك و شلەی دەم واڵا و داو دەرمان لەبەر دەمی‌دا لابەرن. گوناهی منداڵێك چی‌یە ئەگەر شووشەی مەرەکەب سەرەو نخوون بکاتە سەر مافورێك، گوناهی منداڵێکی تریش چی‌یە ئەگەر لە جیاتی ئاو نەوت بخواتەوە؟.

## *گەشەکردنی دەروونی منداڵی دوو ساڵە:*

١: منداڵی دوو ساڵە زیاتر خۆی بە دایکی دەبەستێت، چونکە بۆی ساغ بووە کە دایك یەکەم مرۆڤە ئاسایش و هێمنی و خامۆشی پی‌دەبەخشێت، دەشێ دایك لەم هەڵسوکەوتەی منداڵەکەی بێزار بێت و لەلایێکی تریشەوە هەست بە تاوانباری بکات، بە تایبەتی ئەگەر فەرامۆشی کردبێت یان بۆ ماوەیەکی بەجێ هێشتبێت، بۆیە ئەگەر لە کارەکەی هاتەوە بە پەرۆشەوە دەچێتە لای و ئەگەر بۆ کاریش بڕوات بۆی نەسرەوت دەبێت، منداڵیش ڕووانگەیێکی هەستیارە هەر کە بەدەروونی زانی، ئەو ساکە دەست بە چەوسانەوەی دەکات و دەیەوێت هەرگیز لێی جیا نەبێتەوە، بۆ ئەوەی ماوەیێکی زۆری لەگەڵ دا بێت، دەشێ چەند جارێك بۆ ئاودەستی ببات و پێویستی‌یەکەی بەجێ نەهێڵێت، یان چەند جارێك شتێکی لێ داوا بکات، یان بە ئانقەست نەخەوێت.

وا باشە دایك کە منداڵەکەی بەجێ دەهێڵێت بۆی نەسرەوت نەبێت، کە گەڕیەوەش باری دەروونی هێمن بێت و لە هەمان کاتیشدا فەرامۆشی نەکات و لە خۆشەویستی و سۆزی‌دا بێ بەری نەکات. پەروەردەکاران دەڵێن: ((پەیوەندی بە هێزی نێوان دایك و منداڵی دوو ساڵە بۆ بەستنی پەیوەندی باشی منداڵەکە لەگەڵ خەڵکدا گرنگە، هەمیشە هانی دەدات بۆ پوخت کردنی رەفتاری لە خۆپەرستی و پەستی و دەمارگیراندا و مایەی دەروون ساغی ئەنجام دەداتەوە، چونکە زۆربەی ئاڵۆزی دەروونی بۆ مایەی نەگونجانی مەردوم لەگەڵ خۆی و خەڵکدا دەگەڕێتەوە.)). ((لینت لویس))یش دەڵێت



((لەگەر پەیوەندی منداڵ بە دایکییەوە بە هێز بێت، راستە جیابوونەوەی لە دایکی گران و سەختە، بەڵام دەتوانێت بەرهەڵستی بکات.)).

٢) منداڵی دوو ساڵە حەز بە هەردوو دەسەڵاتی دایك و باوکی ناکات، دەشێ بە دایکییەوە بسووتێت و لەگەڵیدا بسازێت و بەخۆتێ هەڵ قورتاندنی باوکیشی شاد نە بێت، بۆیە پێویستە لەسەر باوك ئەم رووکارە بەرِشت نەزانێت و بە دەمارگیرانی دا نەنێت، بەڵکو دەبێ هەندێ لە کاتەکانی بۆ منداڵەکەی تەرخان بکات، یا یاری لەگەڵیدا بکات، یا بیبات بۆ گەرانێك و بیلاوێنێت و رامی بکات و خۆی بە هاورێی دابنێت، باوك لە میانی گفتوگۆ و چالاکی و یاری و گەرانی لەگەڵ منداڵەکەیدا فێری رەوشتی پاك و پیاوانەی دەکات و گیروگرفتەکانیشی چارەسەر دەکات بە مەرجێ بۆ خۆی هێمن بێت وبە کردار و بەرەوشت رەوشتە باڵاکان بخاتە دڵی یەوە و گیانی بۆ سەرکەوتن هان بدات، ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((پێش ئەوەی بیر لە خولقاندنی پیاوێکدا بکەین، پێویستە بۆ خۆت پیاوبیت و باشترین نموونەی بۆ منداڵەکەت ببیت)). ئەوساکە منداڵەکەش دەزانێت باوکی خەنیمی نییە و لە هەمان کاتیشدا پێویستە لەسەر منداڵەکە بە خۆشەویستی دایك وباوك بۆ یەکتری بزانێت و مافی ئەوەشی نییە لە یەکتریان جیا بکاتەوە و خۆی بە مێملی باوکیدا بنێت.

٣) منداڵ لە نێوان ((١،٥ ٢،٥)) ساڵی تەمەنییەوە خۆپەرستە و بەرادەیێك شتی منداڵانی تر بۆ خۆی زەوت دەکات و بە ئاسانی نای داتەوە، ئەم رووکارەشی دەبێتە مایەی شەرمەزاری دایك لەناو کۆمەڵ دا، یا دایك هەرەشەی لێنەکات و تەریقی نەکات، نەوەکو شەرم دای گرێت و دەروونی بهەژێنێت، منداڵ فێر دەبێت چۆن رێز لە موڵکی خەڵکدا بنێت کەی رێز لە موڵکیدا نراو دەبێ کەل و پەلی یاری کردنی خۆی هەبێت و قوژبنێکیش لە ماڵدا بۆ یان تەرخان کرابێت.



٤- منداڵانی دوو ساڵە بە گیانێکی هاوکاری یانە یاری لەگەڵ یەکتریدا ناکەن، چونکە نەگەیشتونەتە رادەی گەیوی لەش وهۆش کەچی ئارەزوویان زۆرە بۆ چاوەدێری یەکتری و لە تەگ یەکتردا بن. نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((منداڵی دوو ساڵەت ببە لای منداڵانی تر بۆ یاری کردن تاکو پێیان شاد بێت و لە تەمەنی داهاتووی دا لە گەلیاندا بگونجێت و یارییان لەگەڵ بکات.)).

٥- منداڵی دوو ساڵە ئەگەر بڕیاریدا، بڕیارەکەی زوو دەگۆڕێت، هەندێ جاریش لاملە هەر دەیەوێت قسەی خۆی بچەێتە سەر، لە هەمان کاتیشدا هەست بەوە دەکات کە یەکێك فەرمانی بەسەریدا سەپاندووە و لەسەر بڕیارەکەیدا ڕشت دەبێتەوە، واباشە دایك خۆی لە کاروبارێدا هەڵ نەقوورتێنێت و زۆری لێنەکات و سەربەستی پێ ببەخشێت، لە هەمان کاتیشدا نەبێتە بەندو کۆتەی ئارەزووە بێ جێیەکانی. منداڵی دوو ساڵە بەرەنگاری چەند گۆڕانێك دەبێتەوە کە کارێکی گرنگ دەکەنە سەر کەسیەتی، والە خوارەوە باسیان دەوکەین:-

## یەکەم / لە شیر کردنی منداڵ:

لە شیر کردنەوە کردارێکە هێدی هێدی منداڵ لەسەر خواردنی ئەو خواردەمەنیەی کە گەوران دەی خۆن رادەهێنێت، چونکە دوای مانگی شەشەم لەتەمەنی منداڵدا شیری دایك بۆ گەشەکردنی بەش ناکات، پێویستە منداڵ خواردنی تر بخوات، ئەگەر لە کاتێکی زووەوە منداڵ خوادەمەنی تر نەخوات زۆر زەحمەتە لەسەریدا رابێت. با هەر لە مانگی سێیەمی تەمەنیەوە گوشراوی بداتێ، یاخود دەتوانێت کولاوی بداتێ کە ئامادەی بەم جۆرەیە: ((کەوچکێکی گەورەی ئارد تێکەڵ بە دوو کەوچکی ئاو دەکرێت و شیریش دەخرێتە ناوی وتێ کەلاوەکە بۆ ماوەی ((٥)) خولەکە دەخرێتە سەر ئاگرێکی کزەوە، پاشان سارد دەکرێتەوەو دەخرێتە ناو مەمەو دەرخواردی منداڵەکە دەدرێت.)). وا چاکە لە ژەمی نیوەڕۆدا بیخوات. لە مانگی چوارەمی تەمەنیەوە دەتوانێت شۆربای برنج بە شیر و هێلکەی بداتێ، لەگەڵ دەست پێکردنی مانگی پێنجەمدا دەتوانێت دوو ژەم شۆربای سەوزەی بداتێ. منداڵ کە تەمەنی گەیشتە شەش مانگ بایەخ بە کەوچکی بچووك دەدات و کووپی بچوکیش هەڵ دەگرێت، پێویستە هەردووکیانی بدرێتێ تاکو یاریان پێ بکات و لەسەر بەکارهێنانیاندا رابێت. پەروەردکاران دەڵێن: ((منداڵ هەرلە تەمەنی شەش مانگیەوە هەست بە سەربەستی خۆی دەکات و حەز دەکات خواردنەکەی دوور لە باوەشی دایکیەوە بخوات، بۆیە شووشە شیرەکەی بە دەستیەوە دەگرێت و هەوڵ دەدات دەستی دایکی لە شووشەکەوە دووربخات، ئەم هەستەشی پەرە دەسێنێت، کەی لە خۆی رابینێت و بتوانێت متمانەی پێبکات و دەرفەت بۆ وەدی هێنانی ئەم ئارەزووەی درایی.)). ئەنجا پێویستە خواردنی هەمە چێژو هەمە چەشنی بدرێتێ هەروەکو گوشراوی پرتەقاڵ و تەماتە و میوەی تر و هەنگوین و کێکی ووردکراو، واباشە دایك متمانە بە خواردنەکانی مەڵبەند بکات نەك خواردنی قوتوو کە هیچ سوودێکی ئەو تۆی نییە.
لە نێوان مانگی ((٧ ١٢))ی تەمەنیەوە دەبێ ((٣٠ ٥٠)) گرام گۆشتی بدرێتێ، چونکە لە دەوروبەری مانگی نۆیەمی تەمەنیەوە ددانە شیرەکانی منداڵ بەدیار دەکەون، لە کۆتایی

ساڵی یەکەمی تەمەنی‌یەوە شەش ددانی دێن و لە تەمەنی (١,٥) ساڵی‌دا (١٢) ددانی دێن و لە تەمەنی دوو ساڵی‌دا (١٦ ٢٠) ددانی دێن و دەتوانێت بەشداریمان بکات لە خواردنـدا و هەست دەکات کە لە شتێکی تایبەتی خۆی هەیە و بەدایکی‌یەوە نەبەستراوە. دایکی هۆشمەند ئەم گەشەکردنە رووکارەی منداڵەکەی رەچاو دەکات و هێدی هێدی مگێزی منداڵەکەی بۆ خواردنی هەمە جۆرە دەکاتەوەو یەك لە دوای یەکیش ژەمە شیرەکانی کەم دەکاتەوەو هەروەکو جارانیش دەی‌خاتە باوەشی یەوە و دەی لاوێنێتەوە و لە کاتی خواردنی‌دا بۆ زاڵ بوون بەسەر گیروگرفتەکانی‌دا هانی دەدات. زانایانی خۆراك زۆر بایەخ بە مگێزی مەردوم لەسەر خواردەمەنی‌دا دەدەن و دەڵێن: ((ئەگەر مەردوم مگێزی بۆ خواردن هوبێت، کەڵکی لێوەردەگرێت و خۆشیی لێ دەچێژێت.)). بۆیە دەبێ مگێزی منداڵ بەرێبازی ئامادە و پێش کەش کردنی خۆراکەکە وریا بکرێتەوە و بارێکی دەروون هێمن و شێنەیی و خۆشی و شادی بسازێنین و قاپ و کاسەی شیاوی بۆ ساز بکەین. هەست کردنی منداڵ بە برسێتی سروشتی‌یە، ئەگەر برسی بوو نابێ فەرامۆشی بکەین تاکو فێری گریانی بەهۆو بێ هۆ نەبێت و مگێزی بۆ خواردن سارد نەکەین و شارەزایی ناخۆشی لە عاستی هەندێ خۆراکدا نەچێنین و نەوەکو بێزی‌یان لێ‌بکات و لەبەرچاوی‌دا بکەون، ئێمە کە حەز لە هەندێ خۆراك ناکەین هەر سەبارەت بەوەیە وەختی خۆی شارەزایی ناخۆش لە عاستیاندا کپ کراون لەناو دەروونماندا هەر لەو دەمەی کە منداڵ بووین. هەروەها کارێکی نا مرۆڤانەیە هەروەختێك منداڵەکەی برسی بێت دایك شووشەێکی شیری ئامادەکراوی بداتێ، ئەوەی راستی بێت شیری دەست کردە هەموو توخمی خواردەمەنی تێ‌دا نی‌یە، دەشێ منداڵەکەی تووشی خوێن کەمی بێت. هەروەها دەبێ زۆر سەوزەشی نەداتێ نەوەکو تووشی وروژاوی ریخۆڵە بێت.

شیرکردنی کتوپڕ و فڕێودانی منداڵ یەکەم گیروگرفتی دەروونی‌یەتی، بە تایبەتی ئەگەر لە دایکی‌دا جیاو فەرامۆش بکرێت، ئەم رووکارەش دەبێتە مایەی هەڵ گیرساندنی قینە بەری و ناکۆکی نێوان خۆی و دایکی و دەیەوێت هەمیشە تۆڵەی لێ‌بسێنێت. دەشێ لە شیرکردنی کتوپڕ مایەی ترسانی منداڵ لە بێ بەری بوون لە دایکایەتی‌دا ئەنجام بدات بە تایبەتی ئەگەر منداڵەکە تاقانە و بەناز بوو‌بێت و متمانەی زۆری بە دایکی کردبێت، ئەمەش بەدی دەکەین کاتێ دایك لەکار هاتەوە، پێشوازی دەکات و پێی دەنووسێت و نایەوێت لێی جیا بێتەوە، بیانگە دەگرێت بۆ ئەوەی درێژترین کات لەگەڵی‌دا رابوێرێت، وا باشە دایك لەگەڵی‌دا بێت و ئارەزووی کز نەکات و ئەوەندەش کات بە منداڵەکەی ببەخشێت تاکو بە هاورێی هێمن و شاد بێت و دەرفەتیشی بداتێ بۆ ئەوەی پشتی بە خۆی ببەستێت، بەڵام ئەگەر فەرامۆشی بکات و ئەویش لەم فەرامۆشەدا ئەسرەوت بێت و دایکیش سەبارەت بەم رێبازەی هەست بە تاوانباری بکات، ئەو ساکە زیاتر پێی دەنووسێت و زیاتر درنەدا دەگرێت و زیاتریش بۆ

بەرژەوەندی خۆی دەی چەوسێنێت. شیرکردن مانای ئەوە نی‌یە منداڵەکە فەرامۆش بکرێت و لە سۆزی دایکایەتی‌دا بێ بەری بکرێت. منداڵ حەز دەکات سەربەست و سەرفراز بێت و بۆ خۆی شان بداتە بەر ژیان و نایەوێت کۆسپ و تەگەرە بکەوێتە بەر نیازو ئاوات و بەهاو بەهرەکانی بەڵکو دەیەوێت ببێتە خاوەن کەسیەتی خۆی و خۆی لەناو گۆنگەڵی ژیاندا بچەسپێنێت. منداڵێك بواری نەدرێتێ بۆ ئەوەی پشتی بە خۆی ببەستێت و بۆخۆی خزمەتی خۆی بکات و دایك و باوکیشی خۆیان لە هەموو بچووك و گەورەیێکدا هەڵ بقوورتێنن، ئەم منداڵە هەرگیز سەربەستی زامن ناکات و بۆ هەموو هەنگاوێکی لە ژیانی‌دا پرسیار لە دایك و باوکی دەکات و لە هەموو کارو فەرمانی‌دا متمانەیان پێ‌دەکات و ناتوانێت بڕیارێك بۆ خۆی بداتن ئەو ساکە سەرکەوتنی بەدەگمەن دەبێت و بێ بەهاو پایە و سایە لەناو کۆمەڵ دەخولقێت و ناتوانێت بە جوامێری و کەڵە مێردی و باوەڕەوە شان بداتە بەر ژیان. دەشێ ئەم منداڵە کە گەورەش بوو نەتوانێت بە ئارەزووی خۆی هاوسەری هەڵبژێرێت، ئەوساکە یا ئەوەتا دایکی بۆی هەڵ دەبژێرێت و خۆی لە هەمنوو کاروباری‌دا دەسوێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ئاژاوەنان و هاوچاوی نێوان بووك و خەسوو و کەسادی ماڵ وێرانیش بۆ ژن و مێرد دەمێنێتەوە، هەروەها ئەم ڕێبازە چەوتەیە وا لە منداڵەکە دەکات نەتوانێت بۆ خۆی پیشەیێك هەڵ بژێرێت یان لەسەر کارێکدا جێگیر نەبێت. بۆ ئەوەی منداڵ نەبێتە پاشبەندی دایك و باوك و سەربەستی زامن بکات، دەبێ ئەمانەی خوارەوە ڕەچاو بکەین:

١- یەکێك لە زانایانی زانکۆی ((ستراتکلید)) لە لەندەن دەڵێت: ((منداڵ حەز بە سەربەستی خۆی دەکات، ئێمەش دەبێ هانی بدەین بۆ وەدی هێنانی ئەم ئارەزووەی و بەدیارخستنی ئاوات و خواست و نیاز و ڕازی بەبێ بەربەست کردنیان.))

٢- منداڵ حەز دەکات بۆ خۆی خزمەتی خۆی بکات، هەروەکو بیەوێت بۆ خۆی جل و بەرگی لەبەر بکات، یان دەم و چاوی بشوات، یان بۆ خۆی بخوات، ئێمەش هەروەکو نوژدار ((لویب)) وەتەنی: ((دەبێ ستایشی بکەین و هانی بدەین و خۆمان لە کاروباری‌دا هەڵ نەقوورتێنین.)) کەچی ((ژام ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((کارێکی مەردانەیە منداڵ لەسەر پشت بەخۆبەستن ڕابێت، چونکە پشت بە خۆبەستن ڕووالەتی دەروون ساغی‌یە.)).

٣- کارێکی نارەوایە منداڵانمان بە تەنیا لەگەڵ کەل و پەلە یاریەکانی‌دا لە نێوان چوار دیواردا بەند بکەین بە مەبەستی ئەوە سەرمای نەبێت، یان تووشی ئازاری نە بێت، ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((پێویستە دەرفەت بە منداڵبدرێت تاکو خۆشی لە یاری‌یە سەربەستەکانی‌دا بچێژێت و ماسولکەکانی پتەو بن و هەوای بەری‌لا وەربگرێت.)).

٤- هانی بدەین بۆ پشکنین و تۆژینەوە و نایابی و گەڕان و سووڕان و کارامەیی بۆ ئەوەی شارەزای دەوروبەری بێت و لە گەڵی‌دا بگونجێت و بسازێت. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت:

((پێویسته هەموو رۆژێك منداڵمان ببەین بۆ وەرزش کردن لەناو هەوای سازگار و باخچە و کێلگەدا تاکو بە ئارەزووی خۆی یاری بکات و شاد بێت.)).

٥- کارێکی نارەوایە ئەستۆی منداڵەکەمان بە فەرمانی زۆر و بێجێو رێ گران بکەین، چونکە فەرمانی زۆر ئازادی و سەربەستی منداڵەکە بەربەست دەکات. هەروەکو ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((پێویسته منداڵ هان بدرێت بۆ سەربەستی بیرو راو نەهێڵین کەس رکێفی بەسەریدا بسەپێنێت.)).

٦- ئەگەر داوای یارمەتی کرد دەبێ بەهانای بێین و نائومێدی نەکەین، بەڵام دەبێ فێری بکەین چۆن بەسەر گیروگرفتەکانیدا زاڵ بێت و چۆن بەرهەڵستی ژیان بکات وچۆن سوود لە هەڵەکانیدا وەربگرێت؟

٧- بەشداری لە کاروباری ماڵدا بکەین و ماوە بۆ بریار دان و دەربرینی بیرورای بدەین و رێز لە کەسیەتی بنێین.

## دووەم / پێگرتنی منداڵ:

بەپێی لێکۆڵینەوەی ((نانسی بیلی)) لە ((کالیفۆرنیا)) منداڵ لە تەمەنی ((١٣)) مانگیەوە دەتوانێت سەرپێ بکەوێت وبڕوات بە مەرجێ لەساغ نەبێت و تووشی گرفتەی دەروون نەهاتبێت، بەڵام زۆر کارامە نییە و ناتوانێت بە تەواوەتی پشتی بە قاچەکانی ببەستێت. بەرۆیشتن بازنەی کۆمەڵایەتی فراوانتر دەبێت و زیاتریش شارەزای دەوروبەری دەبێت و هەوڵیش دەدات بۆ گونجان لەگەڵ خەڵکدا و ژیانداریان لێ فێر دەبێت و دەستکەوتی زمانی پەرە دەستێنێت. دەشێ منداڵ دووچاری نەخۆشییەکانی قاچ بێت، هەروەکو لاوازی پێ، لە نیشانەکانی:



منداڵ لە میانی مانگی یەکەمی رۆیشتنییەوە دەشەلێت سەبارەت بە کەموو کووری لە پێك هاتنی ئێسقانیدا، دەشێ بۆ خۆی چاك بێتەوە ئەگەر دیاردەکە سادەو ساکار بێت، بەڵام ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر شەلیدا دەبێ پێشانی پزیشکی پسپۆر بدرێت. دەشێ ئێسقانی منداڵ نەرم و لاواز بن و نەتوانێت لەسەر پێ بکەوێت و ئەم دیاردەیە ببێتە مایەی شێواندنی دایك و باوك، رەنگە هەوڵیش بدەن چ بە پارانەوە یان بە زەبر بەسەر پێ بکەوێت، بێ گومان ئەمەش رێبازێکی چەوتە، دەشێ هەڵوێستی لە عاستیدا رەتە چووزاندنەوەیێکی دەروونی برسکێت و

منداڵەکە زیاتر بشێوێت و توانای سەرر پێ کەوتن کەم بێتر دەروونناسان دەڵێن: ((منداڵی شادمان هەمیشە گورج و گۆڵ و چاپوکە، ئەم بارە دەروونی‌یەش کاردەکاتە سەر ئێسقان و پتەو بوونیان و بەرگری دەکەن و منداڵیش بە ئۆقرەیی و پشوو درێژی وادان بەخۆگرتن بەرهەڵستی ژیان دەکات، کەچی منداڵی دەرکەنارو غەمبار ئێسقانەکانی لاواز و بێ توانا و بێ هێزن.)). نوژدار ((ملتۆن لیڤین)) دەڵێت: ((پاشڵی منداڵ بەسەر پێ‌کەوتن دەشێ بەڵکەیێک لە پشێوی دەروونی‌دا بێت.)). دەشێ لاوازی ئێسقانی منداڵ بۆ مایەی کەم مەشق کردنی ماسولکەکان و بەربەست کردنی جموجۆڵیان بگەڕێتەوە. هەروەها کەم نووستنی منداڵ و کەم بوونی ڤیتامین (D)و خوێی کالیسیۆم لە خۆراکی‌دا و بێ بەش بوونی لە تیشکی خۆر ئەمانە هەمووی دەبنە مایەی لاواز بوونی ئێسقانی. هەروەها نا توانێت بەسەر پێ بکەوێت ئەگەر کۆئەندامی دەماری بەسەر ماسولکەکانی‌دا زاڵ نەبێت. بۆ ئەوەی منداڵ بەسەر پێ بکەوێت با ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکەین:-

١- هەر لە تەمەنێکی زووەوە دەبێ هەموو ڕۆژێک گەڕانێکی بۆ ساز بکەین تاکو لەناو باوەشی سرووشتدا تیشکی ڕۆژی لێبدات و هەوای سازگار وەربگرێت.

٢- هەر لەو دەمەی توانی خواردنی شلە بخوات دەبێ چەلاوی گۆشتی بدەینێ چونکە زۆر کالیسیۆمی تێدایە.

٣- دەرفەتی بدەینێ بۆ جموجۆڵ و چالاکی و نەترسێین لەوەی تووشی ئازار و ماندوێتی ببێت چونکە ترسمانی بۆ دەدرمێت و پەکی دەکەوێت و ناتوانێت شان بداتە بەر ئەم چالاکی‌یەی کە جەسارەت و دڵ قائمی دەخوازێت. کە منداڵ دەکەوێتە سەرپێ ئەڵبەت زۆر هەڵە دەکات و وزۆر دەکەوێت. لەم بارەیەوە ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((ئەگەر منداڵەکەت کەوت لەدوورەوە چاوەدێری بکەن پاشان بەبێ نەسرەوتی بڕۆ بۆ لای و بەرووخساری پێبکەنە، ئەویش پێ دەکەنێت و بەدڵ و دەروونێکی قائم بەرهەڵستی ئازاری دەکات، بەڵام ئەگەر دایك بە نەسرەوتی و خێرایی و پەشۆکاوی غار بدات بۆ لای، ئەویش زیاتر دەترسێت و دەگریێ.)). دایکی ئازاو دەروون قائم منداڵەکەشی وەکو خۆی دەبێت چونکە منداڵ سێبەری دایکی‌یەتی‌ژ نوژدار ((ملتون برجر)) دەڵێت: ((پاراستنی منداڵ لە ڕادەبەدەر دەبێتە مایەی زیانی بە درێژایی ژیانی.)).

٤- نابێ بە هیچ جۆرێك بە زەبر مەشق بە ماسولکەکانی منداڵ بکەین، بەڵکو مۆڵەتی بدەینێ بۆ خۆی مەشقیان پێ بکات و هانی بدەین نەك سزای بدەین و ستایشی بکەین نەك ڕەخنەی لێبگرین و سۆز و خۆشەویستی پێ ببەخشین و بە نەرم و نیازی و شێنەیی مامەڵەی لەگەڵ بکەین. منداڵەکەش باوەڕی بە خۆی پتەو دەبێت و سەردەکەوێت هەروەکو ((ایمرسۆن)) وەتەنی: ((باوەڕ بە خۆیی جەوهەرو بنەڕەتی پاڵەوانی‌یە.)).

٥- بەجلکی قورس و پێچانەوە لەشی توند نەکەین، با لەسەر جلکی تەنك و سووك رابێت تاکو لەشی سووك و خنجیلانە بێت و بتوانێت بەرهەڵستی سەرما بکات.
٦- کە منداڵ بۆیەکەمجار بەسەر پێ دەکەوێت و دەڕوات، وا باشە بە پێی خاووسی بڕوات بە مەرجێ گەژ خۆش بێت، چونکە پێیەکانی تەخت و بێ کەوانەن، لەبەر ئەمە شوێنی کەوانەکە هەستیارە کە بە تەنی زبر و رەق دەکەوێت بۆ سەرەوە دەکێشێت کەوانەکە دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر منداڵ لەسەر زەوی تەخت بڕوات و پێڵاوی نەرم لەبەر بکات، ئەوە پێیەکانی هەر بە تەخت ((Flat)) دەمێنێتەوە.
٧- نوژداران ئامۆژگاری دایکان دەکەن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بۆ یەکەم جار سۆڵەی نەرمی مام ناوەندی لەپێبکەن بۆ ئەوەی بزووتنەوەی پێیەکانیان ئاسان بێت، هەروەها پێویستە پێڵاوەکانیان فراوان بن و زوو زوو بیان گۆڕن، چونکە پێیەکانیان زوو گەورە دەبن و پێڵاوەکانیان تەسك دەبن و ئازاری پێیان دەدەن. هەروەکو ((پیرەمێردی نەمر وەتەنی:

پێڵاوو قەبری تەنگ بە ئازارن  دەست تەنگ و رووگرژهەردوو بێکارن

هەروەها دەبێ پێڵاوەکانیان لە پێست دروست کرابن، چونکە پێست سۆدارەو رێ بۆ دەردانی ئارەقە و هەوا گۆڕکێ دەدات. کەچی پێڵاوی لاستیك پێیەکان شێدار و تووشی نەخۆشی بلّقانیان دەکات.

## سێیەم / زمان پژینی منداڵ:

هەروەکو وتمان منداڵ کە لەدایك دەبێت رشتەی بیستنی تەواوە بەڵام رشتەی بێژاندنی ناتەواوە، کە ددانی هاتن و ئەندامانی زمانی گەشەیانکرد ئەو ساکە دەتوانێت چەند برگەیێك رێك بخات و بەجارێك دەریان پەڕێنێت، کە منداڵەکە بووە ساڵێك ووشەیەکی بە تەنیا دەبێژێت. کە تەمەنی بووە ((١٨)) مانگ دەست کەوتی زمانی ((٢٠)) ووشەیە. کەبووە((٢١))مانگدەست کەوتیزمانی((٢٠٠))ووشەیە، کە تەمەنی گەیشتە دوو ساڵ رستەیەك کە لە دوو ووشە پێك هاتبێت بەکاردێنێت کە بە پێویستە سروشتییەکانی بەسترواوە. ((انا فروید)) دەڵێت: ((زمانی منداڵی دوو ساڵە بە چێژییەوە بەستراوە، بە هۆی چێژەوە پەیوەندیی لەگەڵ کەس و کاریدا دەبەستێت.)). منداڵی دوو ساڵە هەندێ ووشە بە ئاوازی خۆش دووبارە دەکاتەوە بە تایبەتی ئەگەر کاری تێ کردبن و سەرنجی راکێشابن. ((کارثی))



و ((جێوم)) و ((لۆریمر)) دەڵێت: ((لا ساکردنەوە هەر لە نیوەی دووەمی ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵ دا دەست پێ دەکات.)). کەچی لاساکردنەوە لەلای ((بریبر)) و ((اشترن)) یەکەم قۆناغی فێربوونی زمانە. ((بیاجە))ش بە یەکەم شەقڵی زیرەکی دادەنێت. لەلای ((مۆریس))یش بە درێژایی قۆناغە گەشەکانی منداڵ بەردەوامە. ((ژان ژاك رۆسۆ)) رەخنەمان ئاراستە دەکات سەبارەت بەوە هەندێ دەستەواژەی گران فێری منداڵمان دەکەین کە لەگەڵ توانای هۆشی ناگونجێن وپێیان دەهەژێت ئەگەر نەتوانێت لاسایان بکاتەوە، زیاتریش دەشێوێت ئەگەر چاوە دێری بکەین ورەخنەیئاراستە بکەین و هەروا دەزانێت فێربوونی زمان پرۆسێسێکی سەخت و گرانە، ئەنجا زمانی تێك دەئاڵێت بە تایبەتی لەگەڵ کەس و کاریدا، چونکە مامەڵەیان دێتە یادی و دەی ورووژێنێت و دەمارەکانی دەشێوێن و رشتەی دەنگیشی لە خۆویستی دەردەچێت، هەر بۆیە هەمان منداڵ لەگەڵ لە یستۆکەکانیدا بە رەوانی دەدوێت. باشترین نموونە بۆ روونکردنەوەی ئەم نیگایە: ((پیاوێك بە هۆی ترسەوە دووچاری ئاڵۆزی دەروونی هاتبوو لە رەبەتی ورووژاو زمانی تێك دەئالا کەچی لە هەڵوێستەکانی تردا هێمن و زمان رەوان بوو؟ ((لانیس))ی لێکۆڵەر دەڵێت: ((منداڵێك لە تەمەنی سێ ساڵ و چوار مانگ بوو، چەپە بوو، زۆری لێدەکرا خۆی بکردایە راستە، ئەم رامیارە تونده وای لێکرد تووشی نەخۆشیی زمان بێت، بەڵام کە وازیان لێهێنا هێمن و زمان رەوان بووەوە.)). ئەوەی راستی بێ منداڵ پەیتا پەیتا و شان بە شانی چالاکییەکانی تری فێری زمان دەبێت ئەگەر تەگەرە نەکەوتبێتە بەر گەشەکردنی رشتەی دەنگی، دەشێ پەلەکردن ببێتە مایەی گرفتە دەمارو نەخۆشییەکانی ومان. بێژاندنی پرۆسێسێکی روو بە روو بوونە منداڵ ئەڵبەت لە کاتی بێژاندنی ووشەدا هەڵەدەکات، ئێمە ئەگەر بە هەرەشەو زەبرەوە بمانەوێت هەڵەکانی راست بکەین، ئەوا ساکە ئەم

بەستەزمانە بیرو دەماری دەشێوێن و گیانی دەخرووۆشێت و دەروونی دەهەژێت و زمانی دەگیرێت و تێك دەئاڵێت. بەردەوام بوونی ئەم ورووژانە دەبێتە مایەی دووچاری منداڵەکە بە نەخۆشییەکانی زمان. لە راستیدا دووبارە کردنەوەی برکەیێك یان پیتێك یا ووشەیێك لە میانی مەشق کردن و راهاتنی منداڵانی دوو ساڵە و سێ ساڵە لەسەر بێژاندندا بە دیار دەکەوێت، چونکە دەترسێن قسە بە رەوانی نەکەن، دەشێ دەمارەکانی بشێوێن وشەرم دای گرێت و ببەزێت، ئەنجا پێویستە لەسەر دایك و باوك نەشێوێن و رانەگەێنن بە کەمو کوورییەکانی و دەروونی نەهەژێنن و نەسرەوتی نەکەن، چونکە ئەم کەمو کوورییانە دیاردەیێکی سادەنە و بۆ خۆیان چاك دەبنەوە، بەڵام ئەگەر دوای سێ ساڵە هەر بەردەوام بوون دەبێ پێشانی نوژداری پسپۆر بدرێت. هەروەها دەبێ بە هێمنی و خۆشەویستی مامەڵەی لەگەڵ بکەین و بە هێواشی لەگەڵی بدوێین و گوێ لە قسەکانی بگرین و فێری بکەین چاك ببیسێت،

چونکە فێرکراوی باش دەبێ بیسەرێکی باش بێت. هەروەها دەبێ رەخنەی لێنەگرین و لەگەڵ منداڵانی تردا بەراووردی نەکەین و لە هەڵوێستی هەڵچووندا دووری بخەینەوە و نەهێڵین هەست بە کەمایەتی بکات. نوژدار ((هێلدا بروش)) دەڵێت: ((چارەسازی نەنگەکانی لەشی منداڵت بکە بە دوورخستنەوەی لە هەست کردن بە کەمایەتیدا.)). هەندێ دایك و باوك وا لە لایان خۆشە منداڵەکەیان هەر بە شێوەی منداڵانە ((Babytalk)) بدوێتن ئەویش حەز دەکات هەر منداڵی ساوا بێت بە تایبەتی ئەگەر سەبارەت بە هاتنی هاوچاوی نوێ فەرامۆش کرابێت، ئەنجا زۆر زەحمەتە زمانی رەوان بێتەوە. فێر نەکردن لە فێرکردنی چەوت باشترە چونکە راست کردنەوەی چەوت سەختە، کەچی فێرنەکردن لاپەرەیێەکی خاوێنە فێرکار دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی شت لەسەری تۆمار بکات. بەڵگەی ئەم رایە ئەوەیە هەندێ کەس کە گەورەشن هەندێ دەستەواژەی هەر بە شێوە چەوتەکەی دەبێژن، چونکە لە منداڵییانەوە فێری بووین، بۆیە دەبێ بە شێوەی راستی منداڵمان فێری دەستەواژە و ووشە بکەین تاکو لاسامان بکاتەوە.

دەروونناسانی ئەمەریکا بەدیاریان خستووە: ئەو منداڵانەی زۆر قسە دەکەن زیرەکترن لەو منداڵانەی کەمتر قسە دەکەن. نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((دواکەوتنی زیرەکی مایەی دواکەوتنی دواندن ئەنجام دەدات.)). کەواتە ئەگەر منداڵەکەمان چەنەباز بوو، دەبێ سەرگەرمیی سارد نەکەینەوە، چونکە ئەمە نیشانەی زیرەکییە، چەندیش لەگەڵیدا بدوێین ئەوەندەش دەستکەوتی زمانی زیاد دەبێت و لە خوێندنەوەش کارامەتر دەبێت.

دەشێ نەخۆشییەکانی زمان بە هۆی کەموکوڕی لە رشتەی دەنگەوە دابن، کە منداڵ دەستی بە دواندن کرد هەناوی کرژ دەبێت و پاڵ بە ناو چەنچك بۆ سەرەوە دەنێت و ئەویش ماسولکەکانی قەفەزی سینگ دەجێنێت و ئەوانیش پاڵ بە هەوای سییەکان بۆ بۆریچکەکانی هەوا ودەنگەژێ و بۆشایی دەمەوە دەنێت، ئەوساکە دەبێ هەوایەکە لەگەڵ برگەو دەنگەکان و چۆنیەتی دەرچوون و ئاوازیاندا بگونجێت، دەشێ منداڵەکە بۆ چەند ترووکەیێك دەمی بکاتەوە و هەوڵی قسەکردن بدات، بەڵام لە جیاتی ووشەی رەوان لە دەمییەوە دەرپەڕێت چەند دەنگێکی تێنەگەیشتراو دەرپەڕن. ((لوریمر)) سییەکان و ناوپەنچك و بۆریچکەکانی هەوا بە ئەندامە سەرەکییەکانی رشتەی دەنگیان دادەنێت و قورقوراگە و شەویلگەو بۆشایی دەم و کونە لووت و گوێ ئەندامانی دووەمیانە، پەك کەوتنی یەکێك لەم ئەندامانە مایەی تێکدانی پرۆسێسی دواندن ئەنجام دەدات. هەروەها هەر کەموکوڕییەکی ئۆرگانی و فەرمانی لە دەمارەکان و مێشکدا هەبێت دەبێتە مایەی نەخۆشییەکانی زمان هەروەکو چەشنەکانی زمان گیران، بۆیە دەبێ چارەیان بکرێت و فەرامۆش نەکرێن، هەروەها پێویستە چارەسازی نەخۆشییەکانی زمان بە رێبازی پەروەردە و دەروونییەوە بۆ ماوەی سێ مانگ بکرێتن واچاکە

دەروونی منداڵەکان بە کۆمەڵ شیتەڵ بکرێت و بە مەشق کردن لەسەر هەناسە و بزووتنەوەی وەرزشی لەشیاندا چارەسازبکرێن. یەکێك لە پسپۆڕەکان دەڵێت: ((فسە زمانی منداڵ نەخۆشییەکی ئۆرگانی نییە بەڵکو بارێکی دەماریی تایبەتە، دەروروبەر و قوتابخانە تارادەیێك کار دەکەنە سەر زمانی منداڵ.)). دکتۆر ((عبد العزیز القوصی)) دەڵێت: ((هەتاکو نەخۆشییەکانی زمانیش درمینە.)). ناوبراو دیتی: لە قوتابخانەیێکدا کە ((٩٠)) قوتابی هەبوون لەسەرەتای ساڵدا ((٥)) یان فسە زمان بوون، بەڵام لە کۆتایی ساڵدا ژمارەی قوتابییە فسە زمانەکان گەیشتە ((١٧)) قوتابی. ((بێرت))یش دەڵێت: ((لە ٥٠ قوتابی قوتابخانەیێکدا لە سەرەتای ساڵدا قوتابییەك فسە زمان بوو، کەچی لە کۆتایی ساڵدا ژمارەی قوتابییە فسە زمانەکان گەیشتە نۆ قوتابی.)).

## *چالاکییەکانی منداڵی دوو ساڵە:*

ئەم خشتەیەی خوارەوە چالاکییەکانی منداڵی دوو ساڵە بە دیار دەخات بە پێی لێکۆڵینەوەیێك کە نوژدار و دەروونناسان بەسەر ((٥٠٠)) منداڵیاندا کردووە.

| تەمەن بە مانگ | چالاکی یەکانی منداڵ |
|---|---|
| ١٣ | ١: جیاوازی نێوان لە پستۆکەکانی دەکات و یەکێکیان زیاتری پەسند دەکات.<br>٢: ئەو مەردومەی ئاماژەت بۆ کردبێت جیای دەکاتەوە.<br>٣: دەتوانێت کونە لووتی خۆی خاوێن بکات. |
| ١٤ | ١: جیاوازی نێوان ئەندامانی خێزان، دایك و باوك وبرا و خوشکی دەکات.<br>٢: دەتوانێت پاڵ بە ئۆتۆمبێلی یاریی بچووك بنێت. |
| ١٥ | ١: بە دوای تۆپ دەکەوێت و کە دۆزییەوە پەنجەی بۆ درێژ دەکات.<br>٢: دەتوانێت رابوەستێت و بۆ ماوەی ((١٠)) چرکەش خۆی هاوسەنگ دەکات.<br>٣: دوا بە دوات واژەی پیتە ئەبجەدیەکان دووبارە دەکات. |

| تەمەن بە مانگ | چالاکی یەکانی منداڵ |
| --- | --- |
| ١٦ | ١ : دەروانێتە ئاوێنەو تەماشای خۆی دەکات.<br>٢: لە چالاکی‌یەکانی‌دا هەردوو دەستی بەکاردێنێت.<br>٣: مانای ژمارەیێك لەوشە دەزانێت و دوو وشەی تێگەیشتراو دەبێژێت. |
| ١٧ | ١: بایەخ بە وێنە دەدات و خۆشی لە تەماشاکردنی‌دا دەچێژێت.<br>٢: ئەگەر بکەوێت بۆ خۆی هەڵدەستێت.<br>٣: مانای ((رستەی دەمت بکەوە)) دەزانێت. |
| ١٨ | ١: لە دووری ((١٠)) مەتر دایکی دەناسێت.<br>٢: سندووقی بچووك دەکاتەوە.<br>٣: بەهەر چوار پەلی‌یەوە بەسەر پلیکانە دەکەوێت و دێتە خوارێ. |
| ١٩ | ١: شتە وێك چوونەکان کۆدەکاتەوە.<br>٢: دەتوانێت تەنێکی بچووك بە دەستی‌یەوە بگرێت ئەگەر چەمابێتەوە.<br>٣: یاری بە ئاو دەکات و لە قاپێکی دەکات و بەتاڵی دەکات.<br>٤: زۆر چەنەبازەو بە ئارەزووی خۆی دەدوێت. |
| ٢٠ | ١: ئەگەر رای لە شتێك نەبوو بەوشەی ((نەء)) و جووڵەی سەری وەڵام دەدات.<br>٢: بۆ ماوەی ((٥))م بەبێ کەوتن غار دەدات.<br>٣: پەنجە بۆ چوار شتی ناوبراو درێژ دەکات. |
| ٢١ | ١: لە شەش پاڵووان قوڵلەیەك بنیات دەکات.<br>٢: دەتوانێت ((٥)) هەنگاو پاشا و پاش بکشێتەوە.<br>٣: پەنجە بۆ بەشەکانی لەشی هەر یەك بە جیا جیا درێژ دەکات. |
| ٢٢ | ١: شتە پەرت و بلاوەکان کۆ دەکاتەوە. |

| تەمەن بە مانگ | چالاکی یەکانی منداڵ |
| --- | --- |
| | ٢: هەریەکە بەناوی خۆی بانگی دایك و باوك و براو خوشکەکانی دەکات. |
| ٢٣ ، ٢٤ | ١: شتە یەك چینەکان دەناسێت ئەگەر چاوی پیّیان کەوت.<br>٢: پارچەیێەك لە جلکەکانی خۆی دادەکەنێت.<br>٣: شەق لە تۆپێك هەڵ دەدات. |

هەروەکو باسمان کرد منداڵی دوو ساڵە گیروگرفتی زۆرە، سەبارەت بەم گیروگرفتانە دەبینین لاملە و حەز ناکات کەس دەسەلاتی بەسەریدا بسەپێنێت، خۆپەرستە دەیەوێت شتی منداڵەکانی تر زەوت بکات، دەیەوێت بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات و کەس سەخلەتی نەکات، لە عاستی باوکییەوە دەماری دەگیرێت و لەلای وایە دایکی لێ زەوت کردووە و بە شەو پیّدزیلکە دەکات بۆ ئەوەی لە یەکتری جیایان بکاتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر دایك و باوك لەسەر یەك ڕێبازی پەروەردەدا ڕێك بکەون تاکو سیفەتە بیّ جیّیەکانی پوخت بکەن و بەکردار و چالاکی و نمونەی باش فێری ڕەوشتی پاکی بکەن نەك بە قسەو هەرەشە و دەمەقاڵی، هەروەکو ((فرۆبل)) وەتەنی: ((پەروەردەی ڕەوشتی بەکردار و هەڵسوکەوت دەست پیّ دەکات و بە بیرو ڕاش کۆتایی دێت.)).

## بەندی پێنجەم
## ((پەروەردەی منداڵی سێ ساڵان تا شەش ساڵان))

لەم قۆناغـەدا کەسـیەتی منـداڵ لـە میـانی جوجـوڵ و چـالاکی و هەڵسـوکەوت و نـەریت و ڕەفتاریدا مۆرگێکی تایبەتی وەردەگرێت. لەم قۆناغەدا دایك و باوکی بە نموونـەی نایـابی یـان دادەنێت و هەستێکی گەرم و ناسك لە عاستیان دا دەیـبزوێنێت، بـەڵام نـا یـەوێت بەربەسـتی سەربەستیی بکەن، هەر بۆیە لاسایان دەکاتەوە. منداڵی لچ دەیەوێت هـەروەکو دایکـی جڵـك لەبەر بکات و خۆی بەدیار بخاتن منداڵی کوڕیش دەزانێتکە لە نەژادی نێرینەیە و شـانازی بـە کـوڕو پـیاوان و بـاوکی دەبـات و دەیـەوێت ڕۆڵـی پیاوانـە لــەبارەی گیـانی و پیشــەیی و کۆمەڵایەتیدا ببینێت و لاسای دیمەن و ڕەوشت و ڕەفتاری بـاوکی بکـات، ئـەم دیاردەیـە پێـی دەوترێنت ((وەدی هێنانی خۆیەتی)) ئەنجا با بزانین چۆن کەسیەتی منداڵ گەشە دەکاتەوە؟

### ١ - گەشەکردنی لەشی منداڵ لەم قۆناغەدا:

لەم قۆناغەدا توانای منداڵ لەسەر جوجوڵی ماسوولکەکان و هـاو گونجـاو کردنـی بزووتنـەوە نێوان دەست وپێیەکاندا گەشە دەکات بۆیە دەتوانێت بە کارامەیی غار بـدات و بـاز بـدات و بونای تاقی دەکاتەوە و نارەزووش دەکات بەسـەر جێگـای بڵنـد هـەروەکو مێز و کورسـی و دیواردا بکەوێت. دایکیش دەبێ زۆر پەرۆشـی پاراسـتنی نـەبێت و جوجـوڵ و چالاکییـەکانی بەربەسـت نـەکات و رووکـاری بـۆ بەرمـەیدان و ئازایـەتی و نایـابی نەفـەوتێنێت و بـە فەرمانەزۆرەکانی گۆشەگیر و داماو و زەبوونی نەکات و هانیشـیبدات بـۆ داهێنـان و شـیرین کاری و دۆزینەوەو تێ ڕوانین، ئاگادار بوونی منداڵ و پاراستنی لە هەموو بچووك و کـەورەێك زیانێکی زۆری پێ دەبەخشن. ئایا دەتوانێت ماسوولکەکانی مەشق و پتەویان بکـات ئەگـەر لـە ژێر رکێفی دایکێکی ترسنۆك و خۆنەگردا بناڵێنێت؟ ئایـا هـەروەکو ئـەو ترسـنۆك نـاخولقێت؟ شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ((منداڵ وێنەی راستەقینەی دایکییەتی، دایکیش چاك و خەراپـەی منداڵیەتی.)). ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((سەربەستیی تەواو بـە منداڵـت ببەخشـە و بـواری بدەینێ بۆ ئەوەی متمانە لە هەڵسووڕانی کاروبارێدا بە خۆی بکات و تەنیا لە کاتی پێویستیدا نەبێت هانا بۆ کەس نەبات.)).

### چالاکی یەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا:

منداڵ لەگەڵ دەست پێکردنی ساڵی سێیەمی تەمەنییەوە جیـاوازی نێـوان قـەوارەی تەنـەکان دەکات و جیا قەوارەشیان کۆ دەکات، دەتوانێت لاپەرەکانی پەرتووکێك هەڵبدات، بە خـێرایی لە پەیژە دێتە خوارێ، شت دەبەستێت و پاڵی پێوە دەنێت، بـۆ مـاوەی (٥) خوولـەکـە چـاوی

دەچەسپێننە سەر شتێکی دەست نیشانکراو، هەستی دیتن و بیستنی لەگەڵ یەکتردا هاوگونجاو دەکات واتە- دەتوانێت شتێك ببینێت و ببیستێت کە هەستی دەورووژێنێت و سەرنجی رادەکێشێت. منداڵ لە پێشەوە هەستەکانی دەخاتە کارەوە بۆ فێربوون، بە بەرکەوتن وتنی روانین و بۆن کردن و تام کردنی شت، هەڵی دەسەنگێنێت و پێی دەزانێت هەروەکو ((ژان ژاك رۆسۆ)) وەتەنی: ((دەست و پێ و چاومان یەکەم ئەندازەی فێربوونمانن.)). منداڵی سێ ساڵە بە چالاکی یاری دەکات، بە دەستێکی تۆپێك فڕێ دەدات، قوڵلەیێك لە چوار شەش پاڵوو بنیات دەکات، بەبێ کەوتن بۆ ماوەی (١٥)م غار دەدات، بەسەر گوریسێکدا باز دەدات، ئاو لە قاپێکەوە بۆ قاپێکی تر دەگوێزێت، قەڵەمی گەورە دەگرێتە دەستیەوە، قۆپچە گەورەکانی جلکیشی رێك دەخات. بە پێی رای شارەزایانی پەروەردە منداڵی سێ ساڵە دەتوانێت ماسوولکەکانی سەر شتی گەورە کۆك بکات، چونکە شتی بچووك چەسپاندنی وورد دەخوازێت، بۆیە پێویستە کەل و پەلە یاریەکانی بۆ ئەم مەبەستە بلوێن.

منداڵی چوار ساڵە گیان سووك و خنجیلەیە و حەزی لە چالاکی و سەربەستیە، یاری بە تۆپ دەکات و بۆ هەواوەی تێ هەڵ دەدات، کووپێکی پڕ لە ئاودا بۆ ماوەی (٣)م بە بێ ڕژاندنی هەڵ دەگرێت، قوڵلەیێك لە هەشت پارچە پێك هاتبێت بنیات دەکات، ڕاستە و ڕاست بە هەنگاوی ((١٠)) سانتی مەتری دەڕوات، دەستەکانی دەشوات و دەیان سڕێتەوە، بۆ ماوەی چرکەیێك لە سەر یەك پێ ڕادەوەستێت، لە قوڕی دەست کردە پەیکەری تەنی شکاوە و چەماوە دروست دەکات، قۆپچەکانی ڕێك دەخات و دەیان کاتەوە، بۆ بڕینی کاغەز مەقەست بەکار دێنێت، بۆ خۆی کەل و پەلی شیاو بۆ یاریەکانی هەڵ دەبژێرێت و پیلان بۆ یاریەکانی دادەنێت، لەگەڵ گەوران دا یاری دەکات و زووش ماندوو دەبێت و بەیڕەوی ڕێسایەکانی یاری ناکات و تێکی دەدات، فەرمانی دایك و باوکیش لە یاری بێ بەری نەکەن و چاوە دێری بکەن و ڕووکاری خۆپەرستی و خۆ سەپاندن لە هەڵسوکەوتی‌دا پوخت بکەن تاکو لە گەڵ منداڵانی تردا بگونجێت و ڕێز لە مافیان بنێت و بە داد و یەکسانی وماف بزانێت. منداڵی پێنج ساڵە هەروەکو شاهە لە ناو باخچەی ساوایان دا، گیانی سووکە و لەشی خنجیلانەیە، لە شوێنی بەرزەوە باز دەدات و هەست بە زاڵ بوون بە سەر لەشی‌دا دەکات و لە چالاکیەکانی‌دا ئازاو کارامەیە و بۆ ئەرك کێشان ئامەدەیە، یاری بە سندووقی گەورە دەکات و لە سەر یەکیان دادەنێت و لە سەر ترۆپیان ڕادەوەستێت و بە ئاسانی سواری کالێسکە دەبێت و پێی شادە. کوڕ دەمەلاسکەی کارو پیشەی باوکی دەکات و حەز دەکات یاریدەی بدات، کچیش ئارەزووی زۆرە بۆ ئەوەی یاریدەی دایکی بدات و لە ئامادەکردنی چێشت و جل شووتن و سڕینەوەی زەوی و ڕێك خستنی کەل و پەلی ناو ماڵ و خاوێن

ڕاگرتنیان بەشداری بکات، لەم بارەیەوە ((نانســـی لاریـك)) دەڵێـت: ((هـەندێ کـەل و پـەلی سادەی ناو ماڵ بە منداڵت ببەخشە و دەرفەتی بەکار هێنانیانی بدەنێ.)). کچ بە بەشدار بوونـی دایك لە ئیش و کاری ناو ماڵدا شادە و بە خاوێن و ڕێك خستنیان ڕووخۆشە و بە کار کـردن ئامۆشە و بە بەرهەمی کەیف خۆشە، دایکی ژیریش ئەم خواستەی دەهێنێتە کایەوە و هـەر لـە بچووکی‌یەوە هانی دەدات بۆ فێر بوونی ئیشی ناو ماڵ و بۆ کـە یـا نـۆی مـاڵێکی لێ هـاتووی



ئامـادە دەکـات و فـێری دەکـات چـۆن هەست بەلێ پرســیاریی بکـات. کوڕیـش ئارەزووی بۆ هـــەر دوو پرۆسێـــی تێـك دان و بنیاتنان زۆرە و ئەندازەی شـیاویش بۆ پتەو کردنی ماسوولکەکانی بەکار دێنێت، دایك و باوکی هۆشمەندیش هانی دەدەن بۆ ئیشـی دەست و کارزانی و کەل و پەلی شیاویش بۆ ئەم ڕووکارە و بە پێـی توانـا و خولیـای منداڵیـان ئامادە دەکەن، خۆ ئەگەر ئەم ئارەزووەی ساردو نابووت بکەن، دەستێ بکەوێتە وێژەی کـــەل و پەلی ناو ماڵ و هەڵیان بوەشێنێت و تێکیان بدات و ئەم کارەشی ببێتە جێی نارەزامەندی‌یان و بـە بزێوی لـە قەڵـەمی بـدەن. زۆر جـار بـە تەختـە



دارێك و چەند بزمارێك و شەکوچێك منداڵ بـۆ ماوەیێك یـاری دەکـات و پێ‌یـان دەخـافڵێت و ئارەزووی تێر دەکـات. هـەروەها منداڵـی پێنـج ساڵە حەز بـە گـەڕان و سـووڕانی نـاو باوەشـی سرووشت دەکات و دەبـێ مۆڵـەتی بدەینـێ بـۆ ئەوەی ئاسۆی چالاکی‌یـەکانی بـە دیـار بخـات و سەیرو سەمەرەی بە دیمەنــە جوانـەکانی مەست بکـات و پێ‌یـان شاگەشـــکە بێـــت. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت:- ((مەردوم بە تاقی کردنـەوە و بە هوی گەشتی و کارو سرووشتەوە فێر دەبێـت و ژیانداری وە دەستی دەکەوێت.))

گەشە کردنی منداڵی شەش ساڵە لـە شـێنەیی دەبێـت و هـێزێکی ماسـوولکەیی زۆریـش لـە غاردان و بازدان و چالاکی هەمە جۆرەدا بەکار دێنێت، چالاکی‌یەکانی وەکو شـەپۆلی زێـن بـە دەگمەن بەربەست دەکرێن، هەر لەم تەمەنەدا دەچێتە قوتابخانە، کـە زەنـگ بـۆ دەرەوە لێ درا وەك لە بەندەوە هاتبێتە دەرێ گۆڕ بۆ گۆڕ پانی قوتابخانە دەخوات و دەست بە غاردان و بازدان و هاوار کردن دەکات و لەو شتانەی کە دەی و ڕووژێنن وریایە و ســەرنج دەداتـە مەڵبـەندی

خۆی و بە پێی ئاستی خۆی دەیەوێت ئارەزووی بۆ فێربوون تیژ بکات، هەڵەی هەرە گەورەی ڕژێمی قوتابخانەی سەرەتایی ئەمەیە: دەرفەت نەداتە منداڵ بۆ دەربڕینی چالاکییەکانی و بۆ ماوەی ((٤٠)) خوولە کە بێ خاتە ناو پۆل و وشەی گران و ڕووتی فێر بکات و داوای لێ بکات بە قەڵەمی وورد بنووسێت و وشەی گران بیژێت و چاوی بچەسپێنێتە سەر تەختە ڕەش و پەڕاو پەرتووك، ئەمانەش هەمووی دەبنە مایەی ماندوێتی و کزبوونی چاو و دەمارەکانی، بەڵگەی قسەمانیش ئەمەیە. بە سەر ژماردن بە دیار کەوتووە: منداڵ لە دوای ساڵی حەوتەمی تەمەنییەوە چاوی کز دەبێت و دەروونی دەهەژێت و گیانی دەشێوێت و هەستی دەخرۆشێت، چونکە ناتوانێت بە تەواوەتی ماسوولکە و جمگەکانی ڕێك بخات و پەنجە و چاو و مەچەکی بۆ ماوەیێکی زۆر و ڕێك و پێك بزوێنێت و دەم و قورقوڕاگەی سەر بێژاندنی وشەی گران کۆك بکات و چاو و بزووتنەوەی دەستی ڕێك بخات و هاوسەنگیان بکات، هەر لە بەر ئەمەیە لە نووسینەوە جاڕزو بێزارە، بۆیە پێویستە لە سەر مامۆستا بە ئەرکی ماڵەوە شانی گران نەکات و گیانی بە ڕوو نووسی زۆری وانەکانی ئەڕە تێنێت، ئەوەکو پەنا بۆ درۆ و تەڵەکەبازی بیات ئەگەر ئەی توانی پێی هەڵ بستێت. بۆیە دەبێ باخچەی ساوایان و قوتابخانەی سەرەتاییەکان هاو شێوازی فێر بوون بن ((سۆزان ئابزکس)) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((نابێ منداڵی باخچەی ساوایان بە کتو پڕی بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکان بگوێزرێت، ئەگەر ئەمەش کرا دەبێ هەر دووکیان لە لایەن ڕێبازی وانەوتن و کەل و پەل و کەرەستەی یاری و بەرنامەکان و هۆیەکانی فێر بوون دا هاو شێوە بن، چونکە منداڵ هەروەکو ئەمامێکە ئەگەر بگوێزرێت بۆ خاکێکی جیا لەو خاکەی تێیدا ڕوواوە ئەوە ئەشوغای پەرە ناسێنێت.)).



قوتابی پۆلی یەکەمی سەرەتایی هەست بەشتی نوێ دەکات و دەیەوێت فێری بێت، ئەمەش دەکەوێتە سەر ئەستۆی مامۆستای کە دەبێ بە ڕوو خۆشییەوە پێشوازی بکات و بە ئۆقرەیی و ئارامی مامەڵەی لەگەڵ بکات. ((ولیم جیمس)) دەڵێت: ((ئەگەر بتەوێت قوتابییت فێر بێت سۆزت بخەرە قاپێکەوە و دەرخواردی بدە.)). دەبێ بە کردار و ئیشی دەست و یاری و قسەی شیرین و نواندن فێری بکات و هانی بدات بۆ سەرنج دان و تێ ڕوانینی سرووشت و بواری بداتێ بۆ بە دیار خستنی بەهاو بەهرە و چالاکییەکانی و شوێنەوارێکی دڵنیایی و هاو دەمی و دۆستایەتی بۆ بسازێنێت تاکو لە گەڵ دەورووبەری نوێدا بگونجێت، ئەکەر هەست بە دڵنیایی و گونجان نەکات زوو لە قوتابخانە بزر دەبێت. هەروەها پێویستە لە سەر مامۆستا و باوك لە سەر یەك ڕێبازی پەروەردە ڕێك بکەون و پەیوەندیی پتەویش نێوان ماڵ و قوتابخانە هەبێت تاکو منداڵەکە لە گەڵ قوتابخانەدا بهۆ گرێت.

## گەشەکردنی هۆشی منداڵی سێ ساڵان تا شەش ساڵان:-

ئەم خشتەی خوارەوە گەشەکردنی هۆشی منداڵ لە سەرەتای ساڵی (٣-٤)ی تەمەنییەوە بە دیار دەخات بە پێی لێ کۆڵینەوەیێك نوژدار و دەروونناسان بە سەر ((٥٠٠)) منداڵدا کرد بوون.

| تەمەن بە مانگ | چالاکییەکانی منداڵ |
|---|---|
| ٢٥ | بە لانی کەمەوە ((١٠)) وشە بەکار دێنێت و مانای ((٢٠)) وشە دەزانێت.<br>بەلاّم بە پێی بۆ چوونی پزیشك عبد الغنی الیوزبکی نوژداری پسپۆری بیستن و دواندن لە خەستەخانەی ((کرامە)) دەست کەوتی زمانی لەمە زیاترە. |
| ٢٦ | جیا وازی نێوان دوو ڕەنگ لە کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگەکان دەکات و بۆتیان دەهێنێت ئەگەر ناویان بزانێت. |
| ٢٧ | جیا وازی نێوان وێنەی بازنە و سێگۆشە دەکات. دەتوانێت بڵێت ((سوپاس))،((لەوێ)). |
| ٢٨ | مانای دەستە واژەی ((تا بە یەك گەیشتن)) دەزانێت و ئاوەڵناوی ((گەرمە)) و ((ساردە)) لە قسەکانیدا بە کار دێنێت. |
| ٢٩ | ڕستەی کورت وەکو ((تۆپم دەوێت)) دەبێژێت. |
| ٣٠ | جیا وازی نێوان وێنەکان دەکات و دوو وێنەی وێك جوون هەڵ دەبژێرێت و تەماشایان دەکات. |
| ٣١ | ١- جلکەکانی دەناسێت ٢- ئاوەڵکرداری شوێنی تێ دەگات. |
| ٣٢ | ١- ڕستە یێك لە ((٤-٥)) وشە پێك هاتبێت دوو بارە دەکاتەوە.<br>٢- دوو کردار لە ڕستە یێك دابن ئەگەر داوامان لێ گرد بە پێیان دەکات. |

| تەمەن بە مانگ | چالاکی‌یەکانی منداڵ |
| --- | --- |
| ٣٣ | ١-پرسیار دەکات و دەڵێت: ((ئەمە چی‌یە؟)).<br>٢- بە شوێنی ئەو شتەی کە پەنجەت بۆ کێشاوە دەکەوێت و دەی دۆزێتەوە پێش ئەوەی بی شاریتەوە. |
| ٣٤ | ١- ئەو شوێنانەی لە کاتی خویَدا دیون دەناسێت.<br>٢- رستەی ((٣)) وشەیی دەبێژێت. |
| ٣٥ | ئەو وێنانەی کەوتنە بەر چاوی دەزانێت چ بابەتێك دەنوێنن؟. |
| ٣٦ | ١: جیا وازی نێوان ناوی کۆمەڵ و ناوی تاك دەکات.<br>٢: هێڵی چەماوە دەکێشێت. |
| ٣٨ | لە قسەکانی‌دا ناوی کۆمەڵ بە کار دێنێت. |
| ٣٩ | ئەگەر پرسیارت لێ کرد: ئەم مەر دومە چی دەکات؟ ئەویش وەڵامت دەدات و هەروەکو بڵێت: نووستووە، غار دەدات |
| ٤٠ | ١: جیا وازی نێوان وێنەی خڕو و چوار گۆشە دەکات.<br>٢: پەیوەندی نێوان (٥) بەشی لەیستۆکێکی دەبەستێت. |
| ٤١ | ١: جیا وازی نێوان (٥) وێنەی ئەندازەیی دەکات.<br>٢: بازنە یێك دەکێشێت.<br>٣: یە سەر هاتی خۆی دەگێڕێتەوە.<br>٤: بە تا مەزرۆیی گویَ بۆ چیرۆکەکانت شل دەکات. |
| ٤٢ | ١: جیا وازی نێوان برگەکانی وشەکان دەکات.<br>٢: خامە دەگرێتە دەستی‌یەوە. |
| ٤٣ | ١: شوناسی شت بە ناوی خۆی دەکات.<br>٢: برگەکانی وشەکان بە شێوەیێکی تیَ گەیشتراو دەبێژێت. |
| ٤٤ | ١- جیا وازی نێوان رەنوروسی ((١ و ٢)) دەکات.<br>٢- باسی چالاکی‌یەکانیت بۆ دەکات. |

| تەمەن بە مانگ | چالاکی‌یەکانی منداڵ |
|---|---|
| | ٣- ئەگەر داوای شتێکت لێ کرد بۆتی دەهێنێت. |
| ٤٥ | ١- بە دوای شتی شارراو دەگەڕێت و دەی دۆزێتەوە.<br>٢- چیرۆکی خۆش دەگێڕێتەوە.<br>٣- وشەی ((ئێوارە، بەیانی)) دەزانێت. |
| ٤٦ | ١: جیا وازی نێوان نێر و مێ دەکات.<br>٢: مانای دوو رستەی ئاوێتە دەزانێت. |
| ٤٧ | ١: مانای وشەی ((برسێتی، ماندوێتی)) دەزانێت.<br>٢: پرسیارەکانی بە ئەندازەی پرسیار کردنی ((کێ، کەی، بۆچی )) دەست پێ دەکات. |
| ٤٨ | ١: باسی دوو شت دەکات.<br>٢: پەنجە بۆ باڵندەکان درێژ دەکات. |

بە پێی بۆ چوونی پزیشك ((عبد الغنی الیوزبکی)) دەست کەوتی زمانی منداڵی چوار ساڵە ((١٠٠٠)) وشەیە، منداڵی شەش ساڵەش دەگاتە نزیکەی((٢٣)) هەزار وشە.

ئەوەش لە یاد نەکەین ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری خێزان و دەورو بەرو مەڵبەندی منداڵ کارێکی گرنگ دەکەنە سەر دەست کەوتی زمانی منداڵ. منداڵ لەم قۆناغەدا زۆر دەدوێت و جەنەباز دەبێت، نزیکەی (٢٠٠) پرسیار لە ڕۆژێك دا ئاراستەی گەوران دەکات، هەروەها پرسیار لە بابەتی ڕەگەزیدا دەکات، هەروەکو پرسیار دەربارەی ڕەنگی ئاسمان بکات، پێویستە بە ڕاستی و بە شێوەیەکی سەلماوی وەڵام بدرێت. دەشێ بپرسێت:

پ/ لە کوێ منداڵ دێت؟

و/ لە ناوەوەی دایکەوە دێت.

پ/ ئایا لە گەدەی‌یەوە دێت؟

و/ نەخێر لە شوێنێکی تایبەتی‌یەوە دێت.

پ/ چۆن دێتە دەرێ؟

و/ لە دەرچەیێکی تایبەتی لە لەشەوە دێتە دەرێ.

لەم تەمەنەدا ئەم وەڵامانە دەم کوتی دەکەن، دەشێ چەند جارێك ئەم پرسیارانە ئاڕاستە بکاتەوە، ئەمەش گەمژەڵی منداڵەکە ناگەیێنێت بەڵکو لە بیری دەچنەوە و دەیەوێت بە بیری بهێنێتەوە، قەت بە وەڵامی چەوت مەی فریوێنە، چونکە ڕۆژێك بە وەڵامەکانت بزانێت و ئەو ساکە باوەڕی پێت لەق دەبێتەوە. منداڵی کچ کە زانی منداڵ لە ناو زگی دایکیدا گەشە دەکات، ئەنجا دەیەوێت لاسای دایکی بکات و بووکە شووشەکەی دەخاتە باوەشی و خۆشەویستی پێ دەبەخشێت، ئەم سۆزەش لە سەر ڕۆشنایی ڕێبازی پەروەردەیدا هەڵ دەچێت. لە هەمان کاتیش دا تێ دەگات کە بە نەژادی مێینە چارە نووس کراوە و دەیەوێت هاو چاوی دایك و ئافرەتانی تر بکات و سەرنج دەداتە کارو پیشەی ناو ماڵ و دەیەوێت فێریان بێت.

منداڵی سێ ساڵە دەتوانێت کەل و پەلی یارییەکانی ڕێك بخات و لە شوێنی خۆیان دابنێت و هەروەها دەستەکانی بۆ خۆی دەشوات و خواردن بۆ خۆی دەخوات و پەرتی ناکات و بۆ خۆی دەچێتە ناو دەست و خۆی بە خاوێنی ڕادەگرێت، چالاکییەکانی هەمیشە لە گەشە داین هەتاکو بە ڕادەیێك پەروەردکاران ساڵی سێیەم بە ساڵی کارزانییان داناوە، کە چی ساڵی چوارەم بە ساڵی داهێنان لە قەڵەمیان داوە، سەبارەت بەوە منداڵی چوار ساڵە زۆر پرسیار دەکات، ((ئەنجلو بتزی)) دەڵێت: ((ئارەزووی منداڵ بۆ پرسیار کردن لە برسێتی مێشکییەتی بۆ زانین ئەم برسێتییە بە وەڵام دانەوەی پرسیارەکانییەوە تێر دەبێت، خۆ ئەگەر فەرامۆش کرا ئەوە هەست بە سستی و خاوی و کزی مێشکی دەکات.)). منداڵی چوار ساڵە گوێ لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن دەگرێت و سروودی خۆشییان لێ فێر دەبێت و چەند جارێك دووبارەیان دەکاتەوە. ((ئانا فروید)) دەڵێت: ((منداڵی سێ ساڵە و چوار ساڵە پرسیاری هەمە جۆرە دەکەن و خەیاڵیان فراوان و بە پیتە و بیر تیژ و داهێنەرن.)).



منداڵی پێنج ساڵە بۆ فێر بوون سەر گەرمە و حەز دەکات بەرهەمی هەبێت، ئەو شتانە دروست دەکات کە خۆشنوودی دەخەنە گیانی دایك و باوکی و ئارەزووی بۆ بڕین و لکاندن و وێنەکێشان زۆرە و بەهرەی لە هونەردا بە دیار دەکەوێت و بەر هەمەکەی پێشانی دایك و باوکی دەدات، ئەوانیش دەبێ بە پێی ئاستی بی نرخێنن، نەك بە پێی ئاستییان و نابێ ڕەخنەی زۆری لێ بگرن و بەهرەکانی بفەوتێنن. وێنەکانی منداڵ دەبنە تۆمار گایێك بۆ ژیانی و لە سەر ڕۆشناییان گیرو گرفتەکانی شیتەڵ بکەین. دکتۆر ((محمود البسیونی)) دەڵێت: ((ئەگەر منداڵ هەڵ چوو بێت یان تووڕە بوو بێت دەبینین قەڵەمی زیاتر دا دەگرێت و هێڵکارییەکەی تۆخ دەبێت. کە چی ئەگەر لە گەڵ شوێنەواردا گونجا و دڵخۆش بوو بێت هێڵکارییەکەی تۆخ نییە.)). یان منداڵێك وێنەی جووتیارێك کە بەری خورما لێ دەکاتەوە بکێشێت و لە وێنەکەدا دەستی جووتیارەکە بگەیێنێتە بەرەکە، ئەم منداڵە بەخشینی بۆ دەرەوە دەبێت و هەوڵ

دەدات بۆ ئەوەی بەشداری دەوروبەری خۆی بکات، کە چی ئەگەر نـاو قـەدی دار خورماکـە بچەمێنێت و بەرەکە بگەیێنتە دەستی جووتیارەکە، ئەم منداڵە دەیەوێت بە ئاسانی هەموو شـتێکی وە دەست بکەوێت، منداڵێکی تر ئەگەر وێنەکانی گەورە بکـات، ئـەوە هەسـت دەکـات کـە مەردومێکی بچووك و بێ هێزو توانایە و ناتوانێت خزمـەتی خـۆی بکـات و گـیرو گرفتـەکانی شیتەڵ بکات. کە چی ئەگەر وێنەکانی بچووك بکات ئەوە لـە بۆشـاییك دا دەترسێت و بـیرو ڕای بە سەر فرازی دەرنابڕێت سەبارەت بەوە گۆشەگیری دەسـەڵاتێکی تونـد و تیـژە. ئەگـەر وێنەی خـانوویێك بکێشـێت و پەنجـەرەی بـۆ نـەکات، ئـەوە دەرکـەنارو دە روون نـاڵۆزاوە. هەروەها وێنەکانی ڕادەی زیرەکیی بە دیار دەخەن ((تایمز)) لێ کۆڵینەوەیێك بە سـەر ((٢٤١)) منداڵیدا کرد تەمەنیان نێـوان (٣-٦) سـاڵیدا بـوو، بـە پێـی ڕادەی زیرەکـی کـرد ینـە دوو کۆمەڵە: کۆمەڵـەی یەکـەم ڕادەی زیرەکییـان مـام نـاوەندی بـوو، کۆمەڵـەی دووەم ڕادەی زیرەکییان بەرز بوو و داوا لە هەر دوو کۆمەڵەی کرد وێنەی ئادەمیزادێك بکێشـن. ((تـایمز)) دیتی: منداڵی کۆمەڵەی یەکەم لە تەمەنی چوار ساڵیان دا چوار پەل بۆ ئادەمیزادەکـە دەکێشـن و لە تەمەنی پێنج ساڵیان دا دەست و چاو و گوێ و پرچ و ناوکی بۆ دەکێشـن و لـە تەمـەنی شەش ساڵیان دا ملی بۆ دەکێشن. کە چی منداڵانـی کۆمەڵـەی دووەم هـەر لـە تەمـەنی سـێ ساڵیان دا چوار پەلی بۆ دەکێشن و لـە تەمـەنی (٣,٥) سـاڵیان دا دەسـت و پـێ و گوێـی بـۆ دەکێشن و لە (٤,٥) ساڵیان دا ملی بۆ دەکێشن و لە (٥) ساڵیان دا قۆپچەشی بۆ دەکێشـن. منداڵی پێنج ساڵە هەڵسوکەوتی لە جاران ڕێکترە و حەز بە یارمەت دان و هاوکاری دەکات و چـیرۆك و بـە سـەر هـاتی خـۆی بـە شـینەیی دەگێڕێتـەوە و پرسـیاری زۆر دەکـات. تـاقی کردنەوەیێکی سەیر بە سەر منداڵێکی پێنج ساڵەدا کرا، ئەویش هەموو ئەو وشە و ڕستانەی بـە درێژایی ڕۆژێك لە دەمییەوە دەر پەڕی بـوون لـە سـەر شـەریتێکی کارەباییدا تۆمـار کـران دیتیان: (١٤٩٣٠) وشە و (١٩٦٧) ڕستە بوون، لە ڕستەکان دا (٤٠٢) پرسیار بـوون و لـە مانەش (٣٩٧)یان پڕ مانا بوون و ئەوانی تریش بێ کەڵك بوون، بە درێژایی ڕۆژەکـە هـەر لـە بەیانییەوە تاکو کاتی نووستنی تەنیا (٣٩) خوولەکە بێ دەنگ مایەوە، ئەمانەش هـەندێکن لـە شێوەکانی پرسیاری: ((چۆن ئەمە ئیش دەکات؟ ئەم شتە بۆ چی باشـە؟ چـۆن ئەمـە بـە کـاری دەهێنین؟ ئەمە چییە؟ )) بێ گومان وەڵامـی ڕاسـت و کـورت و بـە مانـا و ئاشـکرا وتـن و سەلماوی هەموو هیواو ڕازو نیازو ئاواتییەتی. منداڵی پێنج ساڵە دەتوانێت سـازە مـێر بـە کـار بێنێت و بە نەغمەی جوان و دلڕفێن و ئاوازی نەرم شاگەشکە و خۆشنوودە، هـەندێ جـاریش بۆ خۆی ئاواز دادەنێت و جلکی جوان لە بەر دەکات و چەند جارێك لـە ڕۆژێـك دا جلکـی دەگۆڕێت بە تایبەتی کچ، هەروەها بە کارامەتی کەل و پەلی یارییەکانی بـە کـار دێنێـت و لـە

شوێنی خۆیان دادەنێت، ئەنجا پێویستە شوێنێیك لە ماڵەوە بۆیان تــەرخان بكرێــت و ســندووقی پێویستیی بدرێت وفێری ئەریتی ڕێك و پێكی بكرێت.
منداڵی شــەش ســاڵە هەســت دەكــات كــە قۆنــاغی ســاوایەتی بڕیــوە و دەبــێ لــە لای بــراو خوشكەكانی بە سایەی و پایە بێت و دەیەوێت خۆی بە سەریان دا بسەپێنێت و لــە عاســتیان دا بە دەمارەو لە سەر دان پێ نانیان بە كەسیەتیی سوورە و حەز ناكات هەر بە منداڵی نازو فــیزو بچووكەوە لە قەڵەم بدرێت، بۆیە زۆر بایەخ بە ڕاو نرخاندنیان نادات ئەگەر زانی سەربەســتیی بەر بەست دەكەن بەڵام بە نرخاندنی منداڵان لە كەسیەتیی زۆر شادمانە و گرنگ بە بیرو ڕایان دەدات و زۆریش حەز دەكات لێ پرسراوو سەر بەست بێت و هەڵ بستێت بە چالاكیەك كــە بەهرەی پێ بە دیار بخات، بۆیە حەز بە كارێكی سەر بە خۆ دەكــات، دەســت كــەوتی زمــان و گورج‌و گۆڵی لە چالاكیەكانیدا دەرفەتی دەدەنێ بــۆ ئــەوەی پشــتی بــە خــۆی ببەســتێت و كارێكی پێ بسپێدرێت، بۆیە منداڵی شەش ساڵە بۆ قوتابخانە ڕەوانــە و بــە ســەر گــەرمی بــۆی دەچێت و دەیەوێت خۆی لە ژێر ڕكێفی دایك و باوكیەوە دەرباز بكات و بۆ ژیانێكی فراوانتر هەنگاو بنێت.
گەشەكردنی دەروونی منداڵ لــەم قۆناغــەدا:- هــەڵ چوونــەكانی منــداڵ لــەم قۆناغــەدا زۆر ڕەخت و لاسەنگ و سەرچڵن بە ساكاری لە داماوی و ڕوو گرژی و ڕەشبینی و گریان و سەر كەشیەوە بۆ شادی و ڕوو خۆشی و گەشبینی و پێ كــەنین و گــوێ ڕایەڵیــەوە نــاڵو گوێــز دەبێت، ئەم هەڵ چوونانەش بە پێویستە سایكۆ لۆژی و بایۆ لۆژیەكانی بەستراون و لــە ســەر ڕۆشنایی ڕێبازی تێر كردنیان دا پــەیوەندیی كۆمەڵایــەتی لــە گــەڵ شــوێنەواردا دەبەســتێت.
منداڵی سێ ساڵە هەروەكو گووتمان دایك و باوكی زۆر خۆش دەوێت، لــە هــەمان كــاتیش دا نایەوێت لە ژێر دەسەڵاتیان بتاوێت، چونكە هەست دەكات كە مەردو مێكە بوویتە خاوەن بیرو ڕاو سیفەتی خۆی و دەبێ كەسیەتیی بچەسپێت و جێگیر بێــت، كــە چــی منداڵــی چــوار ســاڵە هەروەكو نوژدار ((سپۆك)) وەتەنی: ((زۆر سەر كەشی دەكات و زوو یاخی دەبێت و دەبێ بــە ڕشتی مامەڵەی لە گەڵ بكرێت.)). نوژدار ناو براو دووبارە دەڵێت: ((منداڵانی ئەم قۆناغــە - كوڕ - دایكی خۆش دەوێت و - كچ - باوكی خۆش دەوێت، ئــەم پەیوەندیــە كــار دەكاتــە سەر هەستی ڕاستیان لە عاستی نەژادی تردا و بۆ چۆنیەتی هەڵ بژاردنی هاوســەر ڕوو كــاری دەكێشرێت و دەمارگیران نێوان كوڕو باوك لــە لایــك و كــچ و دایــك لــە لایێكــی دی ڕوو دەدات، هەر لە بەر ئەمەیە بە شەو منداڵ پێ دزیلكــە بــۆ شــوێنی دایــك و بــاوكی دەكــات و دەیەوێت نێوانیان بخەوێت بە مەبەستی ئەوە لە یەكتریان جیا بكات، دەمار گیران نێوان بــاوك و كوڕ دەبێتە مایەی چاندنی ترس لە ناو دەروونی منداڵ و دەربڕینی ئەم ترسەش بە وێنەی خەوی

ناخۆش. هه وەکو دز یان گیانداری درِندە یان مەردومی بالاّ دریّژ لە خەوی‌دا ببینیّت، بەلاّم ئەم دیاردەیە زۆر ناخایێنیت و منداڵ دەکەویّتە ناو کۆنگەڵی ژیان و لە گەڵی‌دا دەگونجیّت.)).

منداڵ لەم قۆناغەدا ئارەزووی بۆ تیّ کەڵ بوون لە گەڵ مندالاّنی تردا زۆرە و رەخنە لە چەپەڵیان دەگریّت و بە توندی هەرەشە لە تاوانباران دەکات بە تایبەتی ئەگەر بۆ خۆی جیّی رەزامەندی بیّت و تیرو توانج بە لا ساران دەگریّت، بۆیە زوو بەرەنگاریی یەکتر دەبنەوە و زووش چاك دەبنەوە، جاری واش بووە دایکان دەمەقاڵی و ناحەزی لە سەر منداڵەکانیان دابووە و منداڵەکانیشیان هەر لەو ساتەوە ئاشنا بووین. دایك و باوکی ژیر هانی منداڵەکانیان دەدەن بۆ ئەوەی تیّ کەڵ بە مندالاّنی دی بن و بگونجیّن و پەیەوەندیی باش لە گەڵیان ببەستن و رەوشتە خۆپەرستەکانیان پوخت بکەن و رەوشتە بالاّکان لە ناو دەروونیان بچیّنن. نوژدار ((سپۆك)) دەڵیّت: ((منداڵت هان بدە بۆ یاری کردن لە گەڵ مندالاّنی ترداو با دیدەنی بکەن و دیدەنیان بکات.)).

لە راستی‌دا منداڵ لە پیّشەوە تەنیا هەر خۆی خۆش دەویّت، ئەنجا دایکی خۆش دەویّت چونکە پیّویستی‌یەکانی جیّ بە جیّ دەکات، پاشان باوك و براو خوشك و کەس و کاری خۆش دەویّت، ئەو ساکە خەڵکیش خۆش دەویّت. بیّ گومان دایکی بە سۆزو میهرەبان دەتوانیّت سوزی مرۆڤایەتی لە ناو دەروونی منداڵەکەی هەر لە ساتی هاتنی بۆ ئەم جیهانە بچیّنیّت و فیّری خۆشەویستی بکات، ئەمەش بە ریّبازی پەروەردەی راست و نموونەی باشی و شیّوازی مامەڵەی لە گەڵ خەڵك دیّنیّتە کایەوە. باوکیش رۆڵیّکی بالاّ دەبینیّت بۆ ئەوەی منداڵەکەی فیّری سۆزی نایابی مرۆڤایەتی بکات، ئەمەش لە بیانی مامەڵەی باشی لە گەڵ هاوسەری و خەڵکی دەوروبەرو بایەخ دان بە پیّویستی‌یەکانی منداڵەکەی‌دا دیّتە کایەوە. شارەزایانی پەروەردە دەڵیّن: ((هەموو پیاوە پیرۆزەکان لە مالیّك دا هەڵ دەکەون کە خۆشەویستی وسۆزی مرۆڤایەتی دروشمی بیّت.)). منداڵیّك لە ماڵەوە هەست بە خۆشەویستی بکات، هەمیشە هیّمن و خامۆشەو پشتی بە خۆی دەبەستیّت و بە باوەرەوە کار دەکات و فەرمانی جیّ بە جیّ دەکات و سەر دەکەویّت و پەیوەندی لە گەڵ خەڵك دادەبەستیّت و ویژدانیّکی مرۆڤایەتی دەبیّت. کە چی ماڵی ناشووب و ئاژاوی منداڵی فیّرە خۆشەویستی ناکات و رووکاری بۆ مرۆڤایەتی ناکیّشیّت و کەسی خۆش ناویّت، هەروەکو شارەزایانی پەروەردە دەڵیّن: ((ئەوی شتیّکی نەبیّت، ناتوانیّت ئەم شتەیە ببەخشیّت.)). ئەو کەسانە منداڵەکە باوەری بە خۆی لەق دەبیّت و سەر ناکەویّت و ئاژاوەجی دەخولّقیّت و پەیوەندیی بە خەڵك شلۆق دەبیّتەوە.

((رۆبرت رۆك)) دەڵیّت: ((کە منداڵ دڵنیا بوو بە بیّ ترس کار دەکات و سەر دەکەویّت و ریّز لە خۆی دەنیّت و خەڵکیش ریّزی لیّ دەنیّن، زۆربەی دەردەکانی رەوشت – هەروەکو

خۆپەرستی و ئاژاوەنان و باوەڕ نەکردن و تەڵەکەبازی و خۆ کشانەوە لە لێ پرسیاریی خـۆرەی یەکەمیان لە ناو ماڵدا گەشە دەکات و بڵاو دەبێتەوە.)). کە چـی مامۆسـتا ((ایرنسـت وود)) دەڵێت: (( ئاشووبەی خێزان کار دەکاتە سەر ڕەوشتی منداڵ و سسـت و مـەلوولی دەکـات و ژیانی تاڵ دەکات.)). بۆیە دەبێ دایـك و بـاوك ببنـە نموونـەی نایـابی ڕەوشـتە باڵاکـان تـاکو منداڵەکەیان لاسایان بکاتەوە. مەبەستی باڵای پەروەردە لە لای ((الغزالی)) و ((ابـن خلـدون)) و ((جۆن لۆك)) و ((هربرت)) و ((فرۆبل)) پوخت کردنی دەروون و گەشـە کردنـی ڕەوشـتی منداڵ بە هۆی نموونەی چاکەوەیە، لە سەرەتای ئەم قۆناغەدا منـداڵ خـۆ پەرسـتە و دەیـەوێت تەنیا بۆ خۆی شتی هەبێت و مافی برایەکانی زەوت دەکات و زۆر بە توندی ئاژاوە دەسـازێنێت و شۆرش هەڵ دەگیرسێنێت و سەرکەشی دەکات بۆ ئەوەی زیاتر لە مافی خۆیدا بسێنێت.
هەندێ جاریش وا دەزانێت هەر بۆ خۆی مافی ئەوەی هەیە دایك خۆشی بوێـت و لـە عاسـتی باوك و برایەکانیدا بە دەمار دەبێت چونکە بەشداری لـــە خۆشەویسـتیی دایکییـەوە دەکـەن. کەواتە ((جۆن دیری)) ڕاستی وتووە: ((منداڵ خۆ پەرستەو دەیەوێت هەموو شتێك بـۆ خـۆی زەوت بکات.)). بۆ ئەوەی منداڵ لە گەڵ گۆنگەڵی ژیان دا بسازێت دەبـێ لـە ئـارەزووە بـێ جێیەکانی پوخت بکرێت و ڕادەیێك بۆیان دابنرێت و فێری ڕێز گرتنی مافی خـەڵك بکرێـت. ((الغزالی)) دەڵێت: ((کاری پەروەردە هەروەکو کاری جووتیـارە دڕك و ڕووەکـی مشـە خـۆر هەڵ دەکەنێت بۆ ئەوەی بەرهەمی باش بێت و قازانجی زۆری هەبێت.)). وا باشە هەندێ کەل و پەلی پێویست و شیاوی پێ ببەخشین بۆ ئەوەی کەل و پەلی یارییەکانی ڕێـك بخـات و یـاریدەی بدەین بۆ ڕێك خستن و پاراستنیان و نە هێڵین شت لە کەس زەوت بکات و کەسـیش شـتی لێ زەوت بکات و دەبێ هەموو منداڵەکانی خێزان شتی تایبەتیی خۆیان هەبن و دایك و باوکیش بە پێی ڕێبازی هاو مامەڵە لـــە گـەڵ منداڵــەکانیان بکـەن و داد و یەکسـانی و سـەر فـرازی بـۆ هەموویان دووشمیان بن و نەش ببنـە دیلـی ئـارەزووە بـێ جێیـەکانی منداڵـەکانیان. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((ئەگەر دایـك و بـاوك خۆیـان کـردە بـەندو کۆتـەی ئـارەزووە زۆرەکـانی منداڵیان، ئەم ئارەزووانە هەرگیز زۆر دەبنەوە و گۆتاییـان نایـەت، دەشـێ داوای چۆلـەکـەی ئاسمانیان لێ بکات.)). منداڵ حەز بە هاوڕێی گەوران دەکات و بە تێ کەڵ بوونی لە گەڵیان دا خامۆشە و حەز دەکات سوود لە ئەزموونەکانیان وەربگرێت و لە میانی هەڵ سـان و دانیشـتن لە گەڵیان دا فێری ژیانی کۆمەڵایەتی دەبێت و بە سەرنج دان ولاساکردنەوە و تۆ ژینەوە فێری هەر دوو ڕێبازی دان و سەندن دەبێت، ئەنجا دەبێ دایك و باوك بۆ چاکە و پیاوەتی و بەزەیی بە هەژار و لێ قەوماوان باشترین نموومە بن. بۆ ئەوەی منداڵ فێری ڕێبازی دان بێت پێویسـتە هـان بدرێت لە موڵکی خـۆی ببەخشـێت، هـەروەکو هـەندێك پـارە لـە ڕۆژانـەی خـۆی یـان لـە یستۆکێکی بداتە منداڵێکی هەژار. هەروەها دەبێ هەر لـــە تەمـەنێکی زووە وە تـێ بگـات کـە

ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەر هەر دوو ڕێبازی - دان و سـەندن - دا ڕاوەسـتاوە نـەك هـەروەکو مشە خۆر لە سەر سەندن دا ڕابوەستێت.
منداڵی سێ ساڵە هەروەکو وتمان هەست بە خۆشەویسـتی دەکـات و بـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی خامۆشی شادە و بایەخی پێ دەدات و سەخڵەتیش نابێت ئەگەر بۆ پوخت کردنی ڕەفتاری وریـا بکرێت، ڕاستە تووڕە دەبێت بەڵام زوو ئاشنا دەبێتەوە ئەگەر بە مامەڵەی باش و دادیی دایـك و باوکی بزانێت و مافی زەوت نەکرێت، حـەز دەکـات تـێ بگـات چ ڕاسـتە و چ چەوتـە و چ پەسەندە و چ ناپەسەندە؟ نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((منداڵ حەز بە ڕابەرایەتیی سوور دەکـات کە لە ناخی دەروونەوە هەڵ کولا بێت، کە چی بە باوکێکی سست و ژێرکەوتوو شادمان نی‌یە چونکە ڕادەیێك بۆ هەڵسوکەوتە بـێ جێیـەکانی دانـا نێـت.)). بـەڵام ئـەوەی منداڵـی جـاڕز کردووە و ئارەزووەکانە بەر بەست کردووە سەپاندنی فەرمانـە زۆرەکـانی دایـك و باوکـە بـە سەری‌دا، لە بەر ئەمە کەم توانایە بۆ هاوسەنگ کردنی ڕەفتاری لە هەموو بوارەکانی ژیـان دا، ئەڵبـەت فەرمانـە زۆرەکـانی دایـك و بـاوك گیـانی دەهـەژێنن و تـەریقی دەکـەن و شـەرمنی دەڕسکێنن، هەر بۆیە باوەڕی بە خۆی کەم دەبێت و هەست بە نـا ئومێـدی دەکـات و گوشـە گیر دەبێت بە مەبەستی ئەوە هەڵە نەکات و بەرەنگاریی لۆمـە و سـەرزە نشـت و هەڕەشـەی دایك و باوکی نەبێت، لە ئەنجامی ئەمەش دا دوو دڵی و ڕاڕایی لە ڕەفتاری‌دا دەڕسکێن و ئەنجا باوەڕی بە خەڵك کەم دەبێت و هـەروا دەزانێـت کـەس خۆشـی نـاوێت و دوو چـاری گـرژە دەمارو گرفتە دەروون دوبێت و تارمایێك لە غەم و پەژارە بـە سـەری‌دا دەکێشـرێت و دایـك وباوکیش هەروا دەزانن هێمنە و ماندوێتی نارسکێنێت. یان دەشێ فەرمانـە زۆرەکـانی دایـك و باوك ببنە مایەی لاساری و چەپەڵی منداڵەکە و هـەردەم سـەرپێچی‌یان لێ بکـات و بیـان خاتـە پشت گوێی. بۆیە ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((ژیری‌یە ئەگەر بە پێی توانـا فەرمانـەکانمان بـە سەر منداڵ‌دا کەم بکەینەوە.)). پێویستە لە سەر دایك و باوك فەرمان بە سەر منـداڵ‌دا نـەدەن ئەگەر زانی‌یان دەیان خاتە پشت گوێی و سامی خۆیان بە فەرمانی زۆر و بێ کەڵك نەفـەوتێنن. چاك وایە فەرمانەکانیان دیارو ئاشکراو بە پێی توانای منداڵەکە بـن و قـەتیش دەرفـەتی نـەدەن سـەرپێچی‌یان لێ بکـات، دایـك و بـاوکی هۆشمـەند دەزانـن کـەی فـــەرمان دەدەن و چـۆن فەرمانەکانیان جێ بە جێ دەکرێن و لـە هـەمان کـاتیش دا سـەر بەسـتیی منداڵەکـەیان زەوت ناکەن. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) ڕوو لە باوك دەکات و دەڵێت: ((پێش ئەوەی بـیر لـە خوڵقـاندنی پیاوێك دا بکەیت، دەبێ بۆ خۆت پیاو بیت.)). زۆر زەحمەتە منداڵ لە گەرمەی یاری کردنی‌دا بێت و بە پێی فەرمانی دایك بۆ گەرماو یان بۆ خواردن ئامادە بێـت، هـەروەها زۆر زەحمەتـە ڕاپەراندنی فەرمانێکی بەرزتر لە توانای منداڵێك کە بـاوك پێـی دەسـپێرێت، بـا ئـەوەش بزانـن منداڵ نا بێتە ئامێریك بە دەستیان بەڵکو مەردوتیکە خاوەن بیرو تواناو کەسیە تیی خۆیەتی.

منداڵ لە نێوان (٤ – ٥)ساڵی تەمەنی‌یەوە سەرنج دەداتە پارە و بە گرنگی بۆ هەر دوو کرداری کڕین و فرۆشتن دەزانێت و تێ دەگات کە هۆێکە لە هۆیەکانی ئاڵو وێڵی نێوان خەڵك و لاسایان دەکات، وا باشە منداڵ لەم قۆناغەدا پارەی خۆی هەبێت و دەرفەتی بدرێتێ بۆ خەرج کردن تاکو فێری ژمارە و ئاڵو وێڵ و مەزاختنی بەرێ و شوێن بێت و بۆ چاو تێری و سەخاوەت و یارمەت دان پاسە کەوتی هان بدرێت و دەست بڵاوی و رژدو چاو چنۆکی لە ڕەفتاری‌دا پوخت بکرێن و لەهێڵێن بە جارێك ڕۆژانەی لە دایك و باوکی‌دا وەربگرێت و نابێ بە هیچ جۆرێك ڕێسوای بکەین ئەگەر وەکو برایەکانی داوای مافی خۆی کرد و ناشبی بە هیچ کلۆجێك جیا وازی نێوان منداڵەکان بکەین. کە منداڵ بە داد و دەست پاکی هەموو ئەندامانی خێزان زانی، ئەویش فێری دەست پاکی و داد و ژیانی کۆمەڵایەتیی هاو بەشی دەبێت و ویژدانیشی مۆرگێکی مرۆڤایەتی وەردەگرێت. نوژدار ((**لوثر وود وارد**)) دەڵێت: ((بۆ ئەوەی منداڵ بە گرنگی ماڵ و سامان بزانێت دەبێ بەشێك لە دەرامەتی خێزانی هەبێت و بەشداری ئەرك و فەرمانەکانی بکات.)).

دەشێ منداڵ لەم قۆناغەدا یاری لەگەڵ منداڵانی تردا بکات و تیپێکیش ڕێك بخەن و تیپەکەش پێشبڕکێ و بەر بەرکانێی تیپێکی تر بکات و هەر ئەندامێك لە تیپەکە دڵسۆزی و خۆ بەخت کردنی بۆ بنوێنێت و قۆشمە بە تیپەکەی تر بکات، بەڵام نە ئەو لایەنگیرە و نە ئەو ناحەزی‌یە بەر دەوامن چونکە هەروەکو وتمان هەڵ چوونەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا ڕەخت و لاسەنگ و سەر چڵن.

## ((گیرو گرفتەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا))

کەڵەپوورو بنچینەی کۆمەڵایەتی و خوو و ڕەوشتی شوێنەدارو ڕەفتارو نەریتی دایك و باوك هەمووی دەپەرچینە سەر ڕەوشتی منداڵ، بۆیە دەبێ بایەخ بە شوێنەوار بدرێت و بۆ پاراستنی نەریت و ڕەفتارو ڕەوشتە باڵاکانی کۆمەڵ دایك و باوك نموونەی نایاب بن و بە هێمنی گیرو گرفتەکانی شیتەڵ بکەن و بۆ ژیانێکی ئاسوودەیی ڕابەری بکەن و دیار دەی تاکسایی و ناوێزە و ڕێز پەڕ و لادانی لا بەرن. وا لە خوارەوە هەندێ گیرو گرفتەکانی منداڵ و لە گەڵ چارە سازیان لەم قۆناغەدا نیشان دەدەین:-

١- ترسانی منداڵ – هۆیەکانی – چارە سازیان:- نوژدار ((جون واتسۆن)) تاقی کردنەوەیێکی زۆری دەربارەی ترسەکانی منداڵ لە خەستەخانەی ((جۆنز هۆپکنز))دا کردووە و بە دیاری خستووە: کە منداڵ بە سرووشتی‌یەوە لە دوو شت دەترسێت ئەوانیش دەنگی بەرزو کەوتنن. ((جۆن)) بە تاقی کردنەوە سەلماندوویەتی منداڵ بە سرووشتی‌یەوە لە تاریکی و ئاگرو گیانەوەر ناترسێت، بۆ ئەم مەبەستە چەند گیانەوەرێك

لە منداڵێکی ساوای نزیك كردەوە، دیتی: لێیان ناترسێت، بەڵام کە ووشترێك بە ڕووییەوە پشمی لێی ترسا. کە چی مامۆستا



((سەلامە موسا)) دەڵێت: ((منداڵ لە کەوتن دەترسێت، چونکە لە دایك بوونی مانای جیا بوونەوەی لە زامداڵ دایە کە لە شوێنەواری دەرەوەی پاراستووە، گرتنی بە شتیش هێمای ترساندن لە کەوتن دەنوێنێت.)).

هۆیەکانی ترسانی منداڵ:– ((جون واتسۆن)) چەند بووکە شووشەیەکی دایە دەست منداڵێك بۆ ئەوەی یارییان پێ بکات و لەو کاتەدا مشکێکی سپی خستە بەر چاوییەوە و دەنگێکی بەرزیشی ڕسکاند، منداڵەکە کە دەنگەکە کەوتە بەر گوێی قیژاندی و مشکەکەی لە خۆی دوور خستەوە، بە دووبارە کردنەوەی ئەم کردارە، دیتی: منداڵەکە خۆی لە مشکەکە دوور دەخاتەوە، لە جاری دەیەم دا منداڵەکە تەنیا بە دیتنی مشکەکە دەترسا. ((جۆن)) دەنگی بەرزی بە کار هێنا کە منداڵ بە سرووشتییەوە لێی دەترسێت بۆ ئەوەی بە ڕێگای ((ڕەت بوونەوەی مەرجی)) منداڵ لە مشکی سپییەوە بترسێت و لە دواییدا لە هەموو گیانەوەرو شتی هاوچووی مشکی سپی بە ڕێگای ((بەستن و پێ نووساندن))ـەوە بترسێت.

منداڵێك کەم بایەخی پێ بدرێت، ئەم منداڵە ڕووالەتێك لە ترس و نەسرە وتی لێی بەدی دەکرێت و دەست بە جووڵاندن و قیژاندن دەکات و دەیەوێت پێویستییەکانی زامن بکات، هەروەها ئەگەر لە ڕۆژێکی تاریك و بە تەنیادا بە جێ هێشترا بێت و فەرامۆش کرا بێت دەترسێت و کە گەورەش بوو حەز ناکات بچێتە ژووری نووستن، چونکە هەروا دەزانێت تەنیایی پشت لێ کردن و بێ بەری بوون دەنوێنێت. ئەوەی ڕاستی بێ منداڵ دەیەوێت هەردەم لە دایکی جیا نەبێت، کە چووە لای بە زەردەخەنە پێشوازی دەکات و ئەگەر لە بەر چاوی بزر بوو دەست بە گریان دەکات. شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ((یاریی چاو شیلکانێی منداڵ ترسی منداڵەکە لە جیا بوونەوەی لە دایکی دەنوێنێت.)). هەندێ شارەزایانی پەروەردەی تریش دەڵێن: ((منداڵ لە تاریکی دەترسێت، چونکە هەر لە دایك بوونییەوە ڕاهاتووە لە ناو ژوورێکی ڕووناك دا بخەوێت، یان دایك بە زەبر دەی باتە ژووری نووستن و دەیەوێت خەوی لێ بکەوێت، ئەویش لە ترسان خەوی لێ ناکەوێت، بۆیە دەبێ هەر لە مانگی یەکەمی تەمەنییەوە لە سەر نووستن لە ناو ژوورێکی تاریك و لە کاتێکی دەست نیشان کراودا بێت.)).

ترس: هەڵ چوونێکی درمیە لە گەورانەوە بۆ منداڵ دەگوێزرێت. ((دار چۆن بێت شێبەرەکەشی ئەوها دەبێت.)). دایکێك کە یەکەم نموونەی منداڵەکەی بێت وپشتی پێ بەستێت و لە تەنگانەدا بە هانای بێت، ئەم دایکە لە پێش چاوی منداڵەکەی بۆ نموونە لە ڕواڵەتی برووسك بترسێت، ئەڵبەت درمی ترسەکەی بە بێ خۆ ویست بۆ منداڵەکەی دەگوێزرێت و هەروەکو خۆی ترسنۆك دەبێتەوە. کە چی دایکی هۆزان ئەم ڕواڵە سرووستییە بە شێوەیێکی سادەو ساکارو بە پێی ئاستی هۆشی منداڵەکەی باس دەکات. لە یەکێك لە باخچەی ساوایان دا مامۆستایەکی ئافرەت ویستی بابەتی ((بۆق)) بۆ قوتابییەکانی ڕاڤە بکات و بۆقێکی بردە ناو پۆل بۆ ئەوەی ببێتە هۆی فێر بوونەوەو وانەی بە جوانی بخاتە ڕووەوە، لە ڕاستیدا مامۆستایەکە لە بۆق دەترسا، بەڵام ناچار بوو ئەمە بکات و هەڵسا خۆی ئازا کردو بۆقی لە سندووق دەرهێنا، بۆقەکەش بازێکی هاویشت و مامۆستاش نەی توانی ترسەکەی کپ بکاتەوە لە ترسان هاواری کردو منداڵەکانیش هەروەکو ئەو هاواریان کردو لەو ڕۆژەووە نەیان توانی نزیك بۆقێك ببنەوە.

لێ کۆڵینەوەیێك بە سەر ((٤٠٠)) منداڵی نێوان (٥ – ١٢) ساڵەی تەمەنیان دا کرایەوەو بە دیار کەوت: زۆربەیان لە شتی شارراودا دەترسان و گیانیان دەهەژاندو دەروونیان دەخرۆشاند.

دەشێ منداڵ بترسێت نەوەکو قەوارەی خێزانەکەیان تێك بچێت بە تایبەتی ئەگەر ناکۆکی و ئاژاوە نێوان دایك و باوکی بەر دەوام هەبێت، دەشێ بترسێت سەبارەت بەوە نەتوانێت ئارەزووەکانی دایك و باوکی بهێنێتە دی بە تایبەتی ئەگەر بیانەوێت بە هەڕەشە لێ کردنی بگاتە ئەو ترۆپەی سەرکەوتن بە بێ ئەوەی تواناکانی ڕەچاو بکەن، هەروەها لە سزادانیان دەترسێت بە تایبەتی ئەگەر بە توندو تیژی مامەڵەی لە گەڵ بکەن، هەندێ جاریش ڕێگای تەڵەکەبازی دەگرێتە بەری بۆ ئەوەی لە سزادانیان ڕزگاری بێت. دەشێ ترس دەرکە ناری بکات و نەتوانێت بە دڵ و دەروونێکی چەسپاو بەر هەڵستی ژیان بکات، مەردومی دەرکە ناریش هەروا دەزانێت شتێکی بزر کردووە و بە دوای دەگەڕێت و نای دۆزێتەوە. دایکی نەفام منداڵەکەی بە شتی ئەندێشەی پڕوو پووچەوە دەترسێنێت لە مەبەستی ئەوە هێمن بێت یان خەوی لێ بکەوێت، منداڵەکەش لە ترسان خۆی مەڵاس دەدات و لە ئەندێشەی چیرۆکی ترسناك ڕێك دەخات و ئەو ساکە خەونی ناخۆش بە شەو دەبینێت، هەروەکو گیانەوەری دڕندە ببینێت و وا ڕاوی دەنێت. بێ گومان خەو ئاوێنەی دەروونی مرۆڤە، خەوی و ڕووژاو ئاوێنەی دەروونی و ڕووژاوە. شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ((ئەگەر منداڵێك لە خەونیدا ماری دێت و وا ڕاوی دەنێت، ئەم خەونە هێمایێکە کە لە باوکی دەترسێت، خۆ ئەگەر قوتابی لە خەونیدا لە بان بکەوێتە خوارەوە ئەم قوتابییە لە تاقیمانە دەترسێت.)). دکتۆر ((عبد العزیز القوصی)) دەڵێت: ((منداڵ لە شتی نەدیوو سەیر دەترسێت کە بە ناخۆشی و هەڵ چوونەوە بەستراوە.)).

منداڵ لە مردنیش دەترسێت، چونکە ڕووکارێکە دوور خستەوەو تەنیایی دەنوێنێت، گەلێ جار لە خەونی‌دا دەکات دەبینێت وا لە ناو سندووقێك دا دانراوە و لە ژێر خاك دا شاردراوە و چەندیش دەکات ناتوانێت بێتە دەرەوە، ئەمانەشی بە سەر دێن ئەگەر ڕووداوی ڕەشبینی و بە غەم و پەژارەی دێنێت، یان چەرمی مردوویێك بەر چاوی کەوتبێت، لە بەر ئەمە توانا هۆشی و باری دەروونی نەگەیشتۆەنەتە ئەم ئاستەو بتوانێت دێرانی ڕووداوی بە شووم و غەم و پەژارە بکات، بۆیە دووچاری کەساسی و داماوی وترسان دەبێت و گیانی دەهەژێت و نەسرەوت دەبێت، هەر بۆیە دەپرسێت: ((چۆن چارە نووسی ئادەمیزاد دوای مردنی دەبێت؟)). خۆ ئەگەر وەڵامی ماقووڵ بۆ پرسیارەکەی وە دەست نەکەوت دەشێ دووچاری گرێی ترسان لە مردن بێت و هەست بە بێ بەهای ژیان و بە چاوێکی ڕەشبینی تەماشای بکات. با سەرنج بدەینە ئەم چیرۆکە: ((فرۆکەوانێك لە کارو فەرمانی‌دا زۆر جست و چالاكو گورج بوو، ڕوو داوێکی ناشووبە ژیانی تاڵ و نائومێد کرد، کە دەروونی شێتەڵ کرایەوە بە دیار کەوت: لە تەمەنی چوار ساڵان دابوو، بە تەنیا خۆی و برایەکەی لە ماڵەوە مابوون، چوونە ڕۆخی ڕووبارێك و لە ناکاو برایەکەی کەوتە ناو ڕووبارەکە و خنکا، ئەم ڕووداوە بە سۆیە لە ناو دەروونی‌دا پەنگی خواردبوو تا بە سەر هاتی خۆی، ئەنجا بە شێوەی هەست بە تاوانباری لە عاستی خنکاندنی برایەکەی‌دا تەقی‌یەوە و لە ژیانی‌دا سست و داماو بێ ئەرکی کردەوە.)). بۆیە پێویستە منداڵ لە ڕووداوی ماتەمی و ناخۆش و تاڵ دوور بخرێتەوە و نەهێڵین چەرمی مردو و ببینێت و بە شێوەیێکی ماقووڵ و بێ و ڕووژاو باسی مردن وژیانەوەی بۆ بکەین، هەروەکو بڵێین: ((ئایا نابینییت چۆن پەڵکی دارەکان لە وەرزی زستان دا هەڵ دەوەرێن و دارەکان هەروەکو مردوو دیارن؟ ئایا نابینییت چۆن پەڵکی هەمان دارەکان لە وەرزی بەهاردا شین دەبنەوە و دارەکان هەروەکو لە نوێوە بژێنەوە؟ ئەو هاش ئادەمیزاد دەمرێت و لە ڕۆژی قیامەت بە هێزی خوای گەورە هەڵ دەستێت.



دەتوانین ئەمەشی پێ بڵێین: ((ئایا نابینییت کە دەنکە گەنمێك دەخرێتە ژێر خاك و چۆن شین دەبێت و بەری زۆر دەبێت؟)).

هەروەها منداڵ لە شتی نوێ ونەنیکە دەترسێت. منداڵێك هاتوچۆی پزیشکێکی دەکرد، وا ڕێك کەوت ماوەێك نەچووە لای، پاشان کە چووە لای بە سەر

سوورمانەوە تەماشای ژووری تیمارگای پزیشکەکە دەکرد لە شتە نوێیەکانی دەترسا.
هەروەها منداڵ لەو گیانەوەرانەی کە بە چیرۆك ناوبانگیان بیستووە یان لە تەلەفزیون تەماشایان کردووە لە ژیانی ڕۆژانەی بە کتوپڕی دیون دەترسێت هەروەکو چیرۆکی ئەو دایکە کە بۆ منداڵە چوار ساڵانەکەی گێڕایەوە بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێت: ((هەبوو نەبوو دێوێکی ئازاو چاپووك هەبوو، دێوی ئازا لە گەڵ سێ وورچ دا بە شەر هات، دوو ورچی کوشت، بەڵام نەی توانی بە سەر وورچی سێیەم دا زاڵ بێت.)). کە دایك چووە ژووری میوانان و کوڕەکەشی بە تەنیا ماوە ئەم بەسەزمانە لە ترسی دێوی ئازا چووە ژێر چارپایەکەی و خۆی شاردەوە.

<u>چارە سازی ترسانی منداڵ:-</u>

١- بە لێ کۆڵینەوەی سایکۆلۆژی بە دیار کەوتووە: ئەو منداڵانەی لە ناو باوەشی خێزانێك دا دەژین کە خۆشەویستی وڕێز لێ نان و سۆزی مرۆڤایەتی دروشمی بێت و هەست بە دڵنیایی و خامۆشی بکەن و شارەزایی گەشبین وناسوودەیی و خۆشنوودی ناو دەروونیان چاندرا بێت، ئەم منداڵانە لە هەموو گیر و گرفتێکی دەروونی دورن، چونکە منداڵ ئەگەر هەست بە خۆشەویستی و ئاوڕدانەوە و ڕوو خۆشی دایك وباوکی بکات، ئەڵبەت لە ژیانیدا دابێنە و پشتی بە خۆی دەبەستێت و متمانەی پێ دەکات، واتە دەروونی ناخرۆسێت و گیانی ناهەژێت و بە دەگمەنیش دەترسێت. ((لیو لیفشین)) دەڵێت: ((ڕووگرژی دوژمنی هەموو پەروەردەیێکە، گیانی منداڵ دەچووزێنێت و نەسرەوتی دەکات و لە ئەنجام دا دەترسێت.)). نوژدار ((لویز وسبۆرن)) دەڵێت: ((منداڵێك خووی بەدد گرتبێت، ئەم منداڵە پێویستی بە ویژدانێکی دامەزراوی هەیە.)). کە چی پرۆفیسووری ئەڵمانی ((هلمۆت)) دووپات دەکاتەوە کە ژیانی خێزانی ئاشووبەیی مایەی پشێوی دەروون و کێشەی دەماریی منداڵ ئەنجام دەدات.

٢- منداڵ لە هەڵ وێستی ترسناك و تەڵەزگەدارو و ڕووژاو و فیلمی سینەما و تەلەفزیۆن و چیرۆك و ڕۆمان و ئەفسانە کە بابەتەکانیان ترس دەنوێنن دوور بخرێت. وا چاکە دایك پێش نووستنی منداڵەکەی چیرۆکی خۆشی بۆ بگێڕێتەوە هەروەکو دایکی وولاتانی ڕۆژئاوا گەشبین و ڕەزامەندی و دڵنیایی لە ناو دەروونی منداڵەکەی بچێنێت، پێش ئەوەی منداڵەکەی بۆ نووستن بچێت، دایك فێری نوێژێك بۆ خوای میهرەبانی دەکات کە چۆن خۆی و خزم و کەسی پاراستووە، ئەو ساکە دای دەپۆشێت و پێی دەڵێت: ((چاوت بنووقێنە و دە جار بڵێ: من بەختیارم.)). منداڵەکەش خەوی لێ دەکەوێت و هۆشی بێ ئاگای ئەم سروودەیە دووبارە دەکاتەوە، بەیانیش کە لە خەو هەڵسا بە ڕوو خۆشییەوە پێشوازی دایك و باوکی دەکات و بە درێژایی ئەو ڕۆژەش گەشبینە. هەروەکو "کورد"

وەتەنی: ((چ بچێنی ئەو دەدوورێتەوە.)). ئەنجا بۆ چی شادی نەخەینــە نــاو دەروونــی ئــەم بەستەندمانە؟. نوژدار ((میلیتا سبرلنج)) دەڵێت: ((خەوی پەشۆکاو شەقڵە بۆ پەشــۆکاری سۆزی مەردوم.)).

٣- هەموومان دەتوانین به سەر تەختە دارێك دا بڕۆین کــه لــه ســەر زەوی‌دا ڕاکشـا بێـت، بەڵام بۆ چی ناتوانین به سەر هەمان تەختە داردا بڕۆین که له نێـوان دوو دیـواری بــەرزدا دانرا بێت؟ بێ گومان لـه دۆخی یەکەم دا هەست به ترس ناکــەین، چونکــه هیــچ هۆیێـك نی‌یە لێی بترسێین. که چی له دۆخی دووەم دا لـه کەوتن دەترسـێین. خـۆ ئەگــەر بــیر لــه کەوتن دا نەکەین دەتوانین به ئاسانی به سەری‌دا بڕۆین. دەشێ زۆربــەی هۆیــەکانی تــرس تەنیا لـه دەست کردەی هۆشمان بــن و لــه ڕیالیســتی دوور بــن. ئــەم جــۆرە ترســەش بــه پەروەردەی چەوت ڕسکاوە. بۆ نموونه دایــك و بــاوك ئاگــاداری منداڵەکــەیان بکــەن بــه جۆرێك دەرفەتی نەدەنێ بۆ جموجۆڵ و شان دان بەر ژیان به بیانووی ئەوە تووشــی ئــازاری نەبێت، منداڵەکەش که گەورە بوو لـه هەموو شتێك دا ڕاڕاو دوو دڵ دەبێت و لــه شـتی شارراو دەترسێت و به سادە ترین ڕووداو دەهەژێت و زوو هەســتی دەخرۆشـێت. منــداڵ که به تەنیا بوو کەوتە سەر زەوی ناترسێت و به خێرایی هــەڵ دەستێت و بــەر هەڵســتی ڕووداوی ناخۆش دەکات و گیانی ناهەژێت. که چی ئەگەر له نزیــك دایکی‌یــەوە کەوتــه سەر زەوی لـه پێشەوە تەماشای ڕووخساری دەکــات، خــۆ ئەگــەر شــەقڵەکانی تــرس بــه سەری‌یەوە کێشرا بن، ئەویش زیاتر دەترسـێت و گیــانی دەهــەژێت. کــه واتــه هــەروەکو ((فرانك کوران)) وەتەنی: ((گیرو گرفتی منداڵ ئاوێنــەی ڕاســتی گــیرو گرفتــی دایــك و باوکانە.)). هەر بۆیە سیفەتە دەروونی‌یەکانی گەوران بــه بــێ خــۆ ویســت بــۆ منــداڵ دە درمێن، واتــه دایــك وبــاوکی نەســرەوت و خــۆ نــەگرو دڵــه خــورت هــەروەکو خۆیــان منداڵەکەیان دەخولقێنن. بــۆ ئــەوەی منداڵێکــی دەروون چەسـپاوو زات دار و جوامـێرو کەڵە مێرد پەروەردە بکەین دەبێ نموونــەی باشــی ئــەم سـیفەتانە بـین و دەرفــەت بدەینــه منداڵەکان بۆ گەڕان و سووڕان و جست و چــالاکی و پشـکنین و داهێنــان و دۆزینــەوە.

دەروونناسێك دەڵێت: ((هەر له منداڵی‌یەوە فێری کەڵە مێردی بووم و بــەبێ نــاز کــردن دایکم خۆشی ویستم، باوکم خۆشەویستی بــه قســه و ئامۆژگــاری دەری نــەبڕی، منیـش توانیم کەسیەتی‌یەکی سەر فراز بۆ خۆم بخولقێنم که لــه توانـام دا هــەبێت بــەر هەڵســتی چەرمە سەری چەرخ بکەم.)). خۆ ئەگەر خوا نەکات نەخۆش بکەوێت، با دایك لــه بــەر چاوی خۆی نەشێوێنێت و به غەمباری خۆی به دیار نەخات و نەترسێت، بــا بــه زانــایی و دەروون قائمی ئاگاداری بکات و بــەنازی نــەکات، ئــەویش بــه جوامــێری بــەر هەڵســتی نەخۆشی‌یەکە دەکات و فێریش دەبێت چۆنڕوو به ڕووی ناخۆشی بێتەوە.

٤- لە ڕێبازە چەوتەکانی چارە سازی ترسانی منداڵ بە ئانقەست منداڵەکەرۆو بەرووی سەرچاوەی ترسەکە بکەینەوە، هەروەکو منداڵەکە لە پشیلە بترسێت و پشیلەیێك بخەینە بەر دەمییەوە، ئەم ڕێبازە چەوتە دەبێتە مایەی چەسپاندنی ترس لە ناو دەروونییەوە. دەتوانین پەیکەری گیانەوەری مەترس بهێنین، لە پێشەوە دەستی لێ بدەین و بە ڕووخسارییەوە پێ بکەنین، منداڵەکەش پێ دەکەنێت و دەستی بۆ دەبات و ترسەکەشی لا دەچێت. لە هەمان کاتیش دا هانی بدەین بۆ بەخێو کردنی گیانەوەری دەستەمۆ، چونکە لە گەڵیان دا دەهۆگرێت و لێیان ناترسێت و بەزەیی یان پێ دێت و لە وەرزی زاوزێ کردنیان دا شتێك دەربارەی ڕەگەز فێر دەبێت و کە هەندێکیان دەمرن بە چاوێکی بێ و ڕووژاو تەماشای مردن دەکات و گەلێ ژیانداریی پێویستی یان لێ فێر دەبێت و خولیاتێکی بە پێتە کاتی پێ دەباتە سەر بەرهەمیش دێتە کایەوە.



٥- نابێ بە هیچ جۆرێك قۆشمە بە بەهاو توانا و بەهرەی منداڵ بکەین، چونکە منداڵ زۆر شانازی بە خۆی دەبات و حەز دەکات ستایشی بکەین. ((الیو نورا کیونیتسوفا)) دەڵێت: ((با منداڵەکەمان سەر شانازی بە خۆیەوە ڕابهێنین، بە تایبەتی ئەگەر بەهرەی لە شتێك دا بە دیار خست، ئەمەش یەکەم باغەی کەسێتی یەتی و فێری بکەین چۆن کاری خەڵك بەرخێنێت و لە هەمان کاتیش دا شانازی بە بەش دار بوونی گەڵ کاری بۆ کۆمەڵ و گەلەکەی دەبات.)). نابێ بە هیچ جۆرێك بە منداڵ بڵێین: ((تۆ ترسنۆکی))، بەڵکو کەم بایەخ بە ترسەکەی بدەین ئەگەر لە ئاندازە بە دەر نەبوو، چونکە دەشێ ئەم کەمایەتی یە بە هەرەشە و پەلاماردانی هاوڕێیانی تۆڵە بکاتەوە، هەروەکو باوکێك بە کوڕەکەی وت: ((بڕۆ ترسنۆك بە کەس ناوێریت.)). منداڵەکەش نەی کردە نامەردی و بۆ سەر شەقام غاریداو کە چاوی بە یەکەم منداڵ کەوت و ڕووتی کردو هاتە پێش باوکی و بە لووت بەرزییەوە پێی وت: ((ئەگەر ترسنۆك بووایم نەم دەتوانی منداڵێك ڕووت بکەمەوە.)).

٦- هەندێ دایك و باوك بوویتە خوو لەلایان بە لچکی ئاین منداڵیان بترسێن هەروەکو پێی بڵێن: ((وا مەکە دەچیتە ناو دۆزەخ، وا مەکە خوا لێت دەدات، ئەمە مەکە گوناهە، جیێو مەدە خوا دەت کوژێ، ئەگەر بە قسەم نەکەیت خوا لێت ڕازی نابێت )). بێ گومان منداڵ هێشتا واتاداری ڕووت تێ ناگات، دەشێ تەماشای ئاین و ڕێنمایەکانی بکات هەروەکو بۆ سزادان هاتبن و لێیان دوو دڵ بێت و بە ترسەوە تەماشایان بکات و هەر شتێکی بە سەر هات خواو پێغەمبەران بە سەری هێناون و لە ئەنجام دا باوەڕی کەم بێت و هەست بە تاوانباری بکات و مایەتی سەرەوەی بۆ هەموو گەورەو بچوکێك سزای بدات و چەند بیری سەخت و ڕەق بە سەریدا بسەپێن و ژیانی تاڵ بکەن. کە واتە مامەڵەی توندو تیژی و ترسانی منداڵ بە لچکی ئاین ڕێبازێکی چەوتە، چونکە خواو پێغەمبەران هەمیشە

سۆزو بەزەیی بە ئادەمیزاد دەبەخشن نەك سزای دەدەن، خوا بۆ خۆی خۆشەویستی‌یە نەك تۆڵە دەسێنێت.

٧- ((هارۆلد تایلۆر)) پەروەرد کاری ئەمریکی دەڵێت: ((هەموو باوکێك دەیەوێت منداڵەکەی گوێ ڕایەڵ و زیرەك و سەرکەوتوو بێت و بتوانێت ئامانجەکانی وەدی بهێنێت بەبێ ئەوەی توانا و ئارەزووو ئاستی هۆشی ڕەچاو بکات، خۆ ئەگەر ئەمەشی پێ نەکرا دەست بە هەڕەشە لێ کردن و سزادانی دەکات، ئەنجا منداڵەکە یا ئەوەتا گۆشە گیرو دەرکەنار بێت یان زیاتر سەر



کەشی و گەمژەلی دەکات.)). بێ گومان منداڵی گۆشە گیر منداڵێکی شەرمن و ترسنۆك و کەم باوەڕ و نەسرەوتە و بە دەگمەنیش سەر دەکەوێت و ناتوانێت هەمیشە داوای مافەکانی بکات، زۆر جار ئەم بەستە زمانە لە ترسی باوکی پەنا بۆ دایکی دەبات و شێوازە مێینەکانی لاسا دەکاتەوە. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((منداڵێك فێری سزادان کرا بێت منداڵێکی ترسنۆکە و هیچ شتێکت بۆ ناکات تەنیا بە هەڕەشە لێ کردنی نەبێت.)). هەر بۆیە پزیشك ((هواردلین)) ڕوو لە باوك دەکات و پێی دەڵێت: ((ئەی باوك منداڵەکەت مەچەوسێنە بۆ ئەوەی ئارەزووتی پێ بهێنێتە دی.)). کە چی پزیشك ((فلورنس باو در میکۆ)) دەڵێت: ((پێویستە لە سەر دایك و باوك دەروونی منداڵەکەیان تێ بگەن، نەك بی کەنە قالبێك لە خۆیانەوە.)). گیانی منداڵ پڕە لە پرۆسێسی داهێنان و شیرین کاری و بە پێی توانا و ئاستی خۆی فێر دەبێت و سەر دەکەوێت. هەر بۆیە ((کالفین ج فریدریك)) لە پەیمانگای نەتەوەیی ئەمریکی دەڵێت: ((ستایش و پاداشتی و دان نان بە کەسیەتیی منداڵ زۆر باشترو بە کارتون لە لۆمە کردنی.)).

٢- خواردەمەنیی منداڵ لەم قۆناغەدا:- ئەو خواردەمەنەیەی منداڵ لەم قۆناغەدا دەخوات کارێکی گرنگ دەکاتە سەر گەشە کردنی لەش و هۆش و ویژدان و تەندروستیی، بۆیە پێویستە خواردنەکە بە شێوەیێکی گشتی بۆ بنیاتنان و پتەو کردنی ماسوولکەکانی بسازێت، بۆیە دەبێ بایەخی پێ بدرێت و هاوکێشە بێت بە تایبەتی بایەخ بە بەرچایی بدرێت. شارەزایانی خۆراك دەڵێن: ((ژەمی بەرچایی ژەمی سەرەکیی ڕۆژە و یاریدەی

منداڵ بۆ وریا بوونەوە و چەسپاندنی هۆشی سەر وانەکانی دەدات و ڕادەی شەکر لە نـاو خوێنیدا دەپارێزێت و یـاریدەی گەشـە کردنـی تیشـووەکانی لەشـی دەدات. گرنگـترین خواردەمەنی کەپرۆتینی تێدابێت هێلکەو شیرو پەنیرە،شەکریش لە مورەبـا و هـەنگوین وە دەستی دەکەوێت و میوە و سەوزەش ڤیتامینیان تـێ دایـە و بـە هـۆی سـیلیلۆز یانـەوەش ڕیخۆڵە دەجمێت.)). منداڵ بە پێی پێویستیی خۆی دەخوات ئەگەر لەشی ساغ و دەروونـی هێمن و هۆشی ساف بێت و مگێزی بۆ خواردن هەبێت. لـە زانکـۆی ((تکسـاس)) تـاقی کردنەوەیێك بە سەر هەندێ منداڵان دا کرا بۆ ئـەوەی بزانرێـت تـا چ ڕادەیێـك مگـێزی منداڵ بە پێویستیی لەش بۆ خواردن بەستراوە، لە تاقی کردنەوەکەدا نە هاندان و نە فێز لێ بوون بۆ هیچ خواردنێك کرا، لە ئەنجامدا بە دیار کەوت: پەیوەندێکی توند نێوان مگـێزی منداڵ بۆ خواردن و پێویستیی لەشی بۆ خواردن هەیە زانکۆی ناو براو ئامۆژگـاری دایـك دەکات هیچ خواردنێك بە سەر منداڵەکەیدا نەسەپێنێت و مگـێزی بـۆ هیـچ خواردنێـك سارد نەکاتەوە. کە منداڵ هەندێ جار مگێزی بۆ خواردن نەچێت مانـای ئـەوە نییـە لـە دۆخێکی ناوێزە دایە، دەشێ ئارەزووی بۆ خواردەمەنی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر کەم یان زیاد بێت. ئـەوەی ڕاسـتی بێـت مگـێزی منـداڵ بـۆ خواردەمـەنی دوای سـاڵی یەکـەمی تەمەنییەوە تاکو ساڵی شەشەمی هێدی کەم دەبێتەوە، ئەمەش جێی مەترسـی نییـە ئەگـەر لەشی ساغ بێت، دەبێ ئەوەش لە یـاد نەکـەین ئەگـەر منـداڵ هـەر لـە سـاڵی یەکـەمی تەمەنییەوە فێر نەکرا بێت خواردەمەنیی هەموو جۆرە بخوات ئەڵبەت لـە سـاڵی دووەمـی تەمەنییەوە ئارەزووی لێ ناکات، بـە دووریشـی مەزانـە ئەگـەر هاڤرکـێ نێـوان خـۆی و دایکیلـەلایێك ونێـوان خـۆیو خواردەمەنییەکەلەلایێکیترەوەدەسـتپێبکات، خـۆ ئەگەربەسەر دایکیدا زاڵ بوو سەبارەت بەمە ئۆقرەی نـەبوو ئـەوە هەمیشـە بـە بیانگـە و گۆزەرەی تەفرەی دەدات و سەری لێ دەشێوێنێت، باشترین چارە ساز بۆ ئەم بارەیە ئەگـەر منداڵەکە نە ساغ نەبێت با دایك خواردنەکەی لە بەر دەمی دابنێت ولێی نەپارێتـەو، خـۆ ئەگەر خواردی ئەوە باشە، ئەگەر نەی خوارد با بـە کشـووماتی هـەڵی بگرێـت، چونکـە منداڵـی بـەناز بیانگـەی زۆرە و دایکـە خـۆ نەگرەکـەی بـە ئـارەزووە بـێ جێیـەکانی دەچەوسێنێت. خۆ ئەگەر مگێزی منداڵ بۆ خـواردن کـەم بێـت بـە هـۆی نەسـاغییەوە، پێویستە زوو چارەی بکرێت و خواردنەکەشی بە پێی پەیامەکانی نوژدار بێت و بە مـەرجێ پڕ ڤیتامین بێت، دەشێ دوای چاك بوونی مگێزی بۆ خواردن ئاسایی نەبێت، وا باشە دایـك بە هێواشی خواردنەکەی بگۆڕێـت نـەك یەکسـەر خواردنـی گرانـی بداتـێ، واش چاکـە گەڕانێکی بۆ ناو باوەشی سرووشت بۆ ساز بکات تاوەکو لە ناو هەوای بەرەڵڵا خۆشنوود و بەتیشکی خۆر خـامۆش و بـە دیمەنـە جوانـەکانی سرووشـت دڵڕفێـن بێـت، ئەمانـەش

مگێڕی منداڵ دەکەنەوە. هەروەها منداڵ ئارەزووی خواردن ناکات ئەگەر کەم نووستێت بۆیە پێویستە لە سەر دایك بایەخ بە حسانەوە و نووستنی بدات، دووبارە مگێڕی منداڵ کەم دەبێت و ئارەزووی خواردنی ژەمە سەرەکییەکان ناکات ئەگەر نێوانیان چلێسی بکات هەروەکو شیرینی بخوات. لە ڕاستی دا زۆربەی ئەم خواردەمەنییانە سوودیان کەمە و ڤیتامین و توخمی باشیان تێدا نییە و دەشبێ پیس بن و دووچاری نەخۆشی هەمە جۆری بکەن. نووژدار ((ڕۆث مۆریس)) دەڵێت: ((هەر وەختێك منداڵەکەت برسی بوو خواردەمەنی بەسوودی بدەیێ چونکە تەندروستیی بەش لە خواردەمەنی بەش دایە.)). هەروەها مگێڕی منداڵ کەم دەبێت ئەگەر دووچاری گرفتە دەروونی هاتبێت و هەستی ڕووشا بێت و غەمی هەبێت، لێرەدا دەبێ هەقی نەدەین بۆ خواردن تاوەکو گرێی دەروونی شل و هێمن نەکرێت و لە هەڵ وێستی و ڕووژاو دوور نەخرێت، چونکە زۆر لە نەخۆشییەکانی ڕشتەی هەرس بە هۆی دەروونی نەسرەتەوە تووشمان دەبنەوە، هەروەها پێویستە لە سەر دایك قاپ و کاسەی شیاوی بۆ ئامادە بکات و کەمیشی بۆ تێ بکات ئەوەکو پەرتی بکات و بە ڕووخسارێکی گەشینی و گەشەوە پێشوازی بکات و بە خۆشنوودی و ڕەزامەندی مامەڵەی لە گەڵ بکات ئەگەر لە گەڵ ئەندامانی خێزان دا بخوات، نابێ بە هیچ جۆرێك ڕەخنە لە شێوەی خواردنیدا بگیرێت ئەوەکو دووچاری گرێی دەروونی لە ئاستی خواردەمەنییەکە بێت. ((**طه حسین**)) نووسەری گەورەی میسر کاتێ بە دوو دەستییەوە خواردەمەنی خوارد، هەموو برایەکانی دایانە قاقای پێ کەنین، ئاو براو لەو ڕۆژەوە خواردەمەنییەکە لە بەر چاوی کەوت، بۆیە دەبێ بە چاوی هان دان تەماشای بکرێت و هەستی ناسك و سۆزی شیرین بۆ ئەم میوانە خجیلەیە بوێت و بایەخ بە شێوەی پێش کەش کردنی خۆراکەکە و ڕێك خستی خوانی



خواردەمەنی بدرێت تاکو مگێڕی بگەشێتەوە. لە مەرجەکانی پرۆسێسی فێر بوون دووبارە کردنەوەی بابەتی فێر کراوو پەیدا بوونی شارەزایی دڵڕوونی لە میانی پرۆسێسی فێر بوون دا، هەر لەو دەمەی منداڵ چاوی بەم جیهانە دەکەوێت، خوای مەزن توانای مژینی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی شان بدات بەر ژیان، ئەنجا دەبێ سەر گەرمی و ئازایەتی کر نەکرێت و دایکیش خواردەمەنی گران و ڕەقی نەداتێ و بایەخیش بە تام و چێژو ڕەنگ و شێوەی پێش کەش کردنی بدرێت. شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ((ئارەزووی مەردوم بۆ ئاهەنگ گێڕان و بانگ کردنی خەڵك بۆ سەر خوانی خواردەمەنی بۆ وە دەست کەوتنی شارەزایی خۆشینی لە میانی مەست بوونی پێویستییەکانیدا دەگەڕێتەوە هەر لەو دەمەی کە منداڵی ساوا بووە.)) دایکی هۆشمەند دەرفەت بۆ منداڵەکەی دەدات بۆ ئەوەی خۆشی لە خواردن بچێژێت، ئەگەر ئارەزووی کرد بۆ خۆی بخوات، با ئارەزووەکەی کز نەکات، تاکو دەستەکانی لە سەر گرتنی شت دا ڕادەهێنێت و چاویش لە هەڵەکانی دەپۆشێت تاکو کارامە دەبێت.

### ٣- چۆن منداڵەکەت فێری نەریتی خاوێنی و ڕێکو پێکی دەکەیت؟:-

دووبـارە کردنـەوە و بـەر دەوام بوونـی هەڵســوکەوتێك دەبنــە مایــەی چەســپاندنی ئــەم هەڵسوکەوتە، ئەویش دەبێتە هەستێك بە بێ خۆ ویست دێتــە ئــەنجام و دەبێتــە نــەریت و لــەق بوونی سەخت دەبێت. بۆ ئەوەی منداڵ فێری نەریتی خاوێنی بکەین دەبێ بەردەوام لە ســەری‌دا مەشقی پێ بکەین و نەهێڵین کەم تەرخەمی لێ بکات. لەو دەمەی منداڵ یاری بە ئاو دەکات بە تایبەتی لە وەرزی هاوین دا دەرفەتی زۆری دەبێت بۆ تێر کردنی سەیرو سەمەرەی و شاگەشکە بوونی بەم شلەیە، دایکی زیرەکیش ئەم دیاردەیە دەکاتــە هـاندەرێك بـۆ دەم و چـاو و دەسـت شووتنی منداڵەکەی، ئەدی منداڵ بە یاری کـردن فـێر نـابێت؟. منـداڵ هـەر لــە تەمـەنی دوو ساڵی‌یەوە دەتوانێــت لــە ئەســتێرکێکی نزمـدا دەســتەکانی بشــوات و لــە تەمــەنی (٣ ٤) ساڵی‌یەوە حەز دەکات بۆ خۆی دەم و چاوی بشوات و تەماشای ئاوێنە بکات و کــاری خــۆی هەڵ بەنگێنێت، ئەنجا شاد دەبێت و شانازی بە خۆی دەبات و بە شۆخ و شەنگ و ڕێکو پێکــی و قەشەنگی دڵڕوون و خۆشنوود دوبێت، بۆیە پێویستە دەست شۆرگا و سابوون و پەشتەماڵ و ئاوێنە و فلچە و هەویری ددانی بۆ ساز بکەین و ڕووکاری بۆ ئارایشــت بکێشــین، منـداڵ لــە تەمەنی (٥ ٦) ساڵی‌یەوە دەتوانێت خۆی بشوات، بەڵام زۆر جار لە گەرما و کردن دا یاخی دەبێت سەبارەت بەوە شارەزایی بە سۆی لەم کارەدا وە دەستی کـەوتووە. لــە زۆر بــەی بـارو دۆخ دا منــداڵ لـــە نێــوان ((١٥ ١٨)) مــانگی تەمەنی‌یــەوە دەتوانێــت خــۆی بــە خاوێنی‌ڕابگرێت،بێ‌گومان هەموودایکێك حەزدەکات منداڵەکەی لەسەر ئــەم خـاوێنی یــە بــەر دەوام بێت، دەشێ ئەم حەز کردنەی وای لێ بکات منداڵەکەی لە سەر ئــەم کـارەدا ڕابـهێنێت پێش ئەوەی ڕشتەی دەردانی ساز بێت و بزانێت مانای خاوێنی چی‌یــە؟ خـۆ ئەگـەر بــە زەبـرو هەڕەشە ل سەر خاوێنی‌دا ڕای بهێنێت، ئەڵبەت منداڵەکە دەشـێوێت و دەروونـی دەچووزێـت. دایکێك لۆمە و سەرزەنشتی منداڵەکەی بکات و ڕەخنەی لێ بگرێت سەبارەت بەوە خــۆی بــە خاوێنی ڕاناگرێت، ئەویش نایەوێت بە ئاشکرا لە دژی بوەستێت، چونکــە دەترسـێت لــە وەی دەستی یارمەتیی لێ ببرێت، ئەم ترسەش بە وێنەی خــەونی نـاخۆش درە دەبڕێـت و لــە لایێکـی تریشەوە خۆشی‌یەکی شارراو لە تەڕ کردنی نووینی‌دا دەچێژێت بـۆ ئـەوەی تۆڵـەی خـۆی لــە دایکی بســێنێت و لــە هـەمان کـاتیش دا ئـەم هاڤرکێیـە دەروونـی دەهـەژێنێت و خـۆی پـێ ڕاناگیرێت. منداڵێك لە تەمەنی (٢ - ٣) ســاڵی‌یەوە بـۆ چـەند هەفتـەیێك خـۆی بـە خـاوێنی ڕابگرێت، بەڵام دوایی سەر هەڵ دانی خەینمی نوێ بیەوێت بۆ قۆناغی دواوە بگەڕێتــەوە و بـە شێوەیێکی نەستی ئاوات بخوازێت هەروەکو برای بچووکی مامەڵە لە گەڵی بکرێت و ئاوڕی لێ بدرێت، ئەم منداڵە هەست دەکات فـەرامۆش کـراوە و وەکـو جـاران بـاوی نـەماوە و کـەس خۆشی ناوێت، هەر بۆیە بە هۆی دەمارگیرانەوە خــۆی تـەڕ دەکـات. نـوژدار ((جـین سـارە))

دەڵێت: ((نەخۆشیی میز کردنی نە خۆ ویست لای منداڵ بۆ هۆی دەروونی و سۆزی زیاتر لــە هۆی ئۆرگانی دەگەڕێتەوە.)). نوژدار ((جین)) داوا لە دایك دەکاتەوە بە هێمنی و هۆزان گیرو گرفتی منداڵەکەی شیتەڵ بکات و خۆی لە کــارو بـاریدا هــەڵ نـەقوورێ تێنێـت و لــە گــەڵ منداڵانی تردا بە ڕاووردی نەکات و بوار بۆ گەش بوونی کەسیەتی بدات وهانی بـدات. بـەڵام هۆیەکانی ئۆرگانی هەروەکو گیرانی ملی میزڵدان و نەخۆشیی شەکرە و هەوکردنی مــیزە ڕوو میزڵدان و گورجیلە دەبنە مایەی تووش بوونی منداڵ بەم نەخۆشییە، ئەو منداڵــەی دووچاری ئەم نەخۆشییە هاتبێت ئەم بە ستەزمانە ناتوانێت بە تەواوەتی میز بکات چونکە هەست بە ئێــش و ئازار دەکات، تنوکە تنوکە میزی دێتە خوارێ و ناتوانێت کۆکی بکات، بۆیە پێویستە پێشانی نوژداری شارەزا بدرێت. باشترین کات بۆ ڕاهــاتنی منـداڵ سـەر نـەریتی خـاوێنی ئـەو کاتەیـە منداڵەکە مانای ستایش و سەرزەنشت بزانێت، دایکیش لــە کــاتی دەســت نیشـان کـراودا بـۆ ئاودەستی ببات، هەروەکو بەیانی، پێش نووستن، منداڵەکەشی بە دووبارە کردنی ئەم کــارە بـۆ خۆی لە سەر خاوێنیدا ڕادێت. ڕێکو پێکی نەریتێکی دەســت کەوتــە نــەك سرووشــتییە، ئــەم نەریتە ئایا بە یاریدەی منداڵ دەدات بۆ پاراستنی لە پشێوی و ناڕەحەتی و لاسەنگیدا، بۆ خۆی هاوسەنگ دەبێت و ڕەحەتی بۆ خۆی و دەوروبەر دابین دەکــات و هێمنیــی پــێ دەبەخشــێت و کاتو ماڵی بۆ پاشەکەوت دەکات و فێری جســت و چــالاکی و ڕاپــەراندنی ئیـش لــە کــاتی خۆیداو بیری ســاف دەکــات. ئەمانــەش هــەمووی دەبنــە مایــەی ســەرکەوتنی لــە ژیـان دا و بەرهەمی هەبێت و لە ناو کۆمەڵدا کاریگەر بێت. بۆ ئەوەی منــداڵ ڕێکــو پێــك بێــت، دەبــێ شتەکانی لە شوێنێکی تایبەتی دابێت بە مەرجێ لە کــاتی پێویســتیدا بــە ئاسـانی بیـان گاتــێ و شوێنەکەش لە شتی تەلەز گەدار دوور بێت و شێدار نەبێت تاکو نەبێتە مایەی لە ناو چوونیــان و شوێنێکی گەورەش نەگرن و دیمەنێکی جوانیش بڕسکێنن، نەك شوێنەکەیان ببێتە مایەی شێوان و تێك چوون و پەرت و بڵاویان، بەڵام چۆن منداڵ فــێری ئــەم نەریتــەی دەکــەین؟ هــەروەکو دەزانین منداڵ لاسای دایك و باوك و ئەندامانی خێزان دەکات، بۆیە دەبێ ببنە باشــترین نموونــە



بـۆ ئــەم نەریتــە. ئایـا شــارەزایانی پــەروەردە ئــاڵێن: ((دایکــی ڕێکوپێــك منداڵەکەشــی ڕێکــە پێکــە؟)). ئەگەر کارێك مەردوم پێی هــەڵ بســتێ پێویســتی بــە هان دان بێت نەك بە سزادان هەروەکو ((فینیلــۆن)) وەتــەنی. بۆیــە دەبــێ لــە میــانی فــێر بوونــی نەریتــە بیروەری خۆشبین لە ناو دەروونیدا بچێنین و هــانی بدەیـن و چـاو لــە هەڵــە زۆرەکــانیدا نەپۆشــین و بەرەڵلای نەکەین. واش چاکە دایك هەر لە تەمەنی سێ ساڵییەوە فێری بکات چــۆن خزمــەتی

خۆی بکات، دەبێ منداڵ شتی تایبەتیی خۆی هەبێت، شـوێنێکیش بۆیـان تـەرخان کـرا بێـت و بواری بدرێتێ بۆ خۆی ڕێکیان بخات و لێ پرسراو بێت و مایەی کەم تەرخەمی بـۆ خـۆی هـەڵ بگرێت، هـەروەکو ئاشـکرایە منداڵـی بـەناز پیشـەی خـەراپ دەکرێـت و دایکیشـی دەکاتـە ئەندازەێیك بە ئارەزووی خۆی دەی چەرخێنێت و فێریش نابێ متمانەبە خۆی بکات، بۆیە دەبـێ منداڵ بەناز بە خێو نەکرێت تاکو نەبێتــە مایـەی نارەحـەتی خـۆی و دەردەسـەری بـۆ خـزم و کەسی، منداڵی بەناز هێزێك نی‌یە فێری ڕژێم و ڕێکوپێکی بکات.

٤- دەمارگیران لەلای منداڵ لەم قۆناغـەدا:- دەمارگـیران دیـاردەێیکی نەسـتی و هوسـتێکی شارراوەیە، منداڵ داوای شتێکی پێ دەکات کە لێـی بـێ بەشـە، یـان داوای مافـە زەوت کراوەکانی پێ دەکات، یان دەی چەکێك بـۆ ئـەوەی ئـاوری لێ بدرێـت و خـۆی پەسـند بکات، ئەم دیاردەیە لەلای منداڵ ئاسایی‌یە و بوونیشی بۆ پێ گەیاندنی بەهرەی پێویستە بە مەرجێ لە ڕادە بە دەر نـەبێت، لـە ڕاسـتی‌دا دوو هـەڵ چوونـی هـاو پێچەوانـە لـە نـاو دەروونی منداڵ‌دا گڵ دەخۆنەوە: ئەوانیش خۆشەویستی و کینەنەکـە بـۆ سـەلماندنی بـیرو ڕای و سەپاندنی دەسەڵاتی و بەرز بوونی پایەی لە نـاو خـێزان دا بـە کاریـان دەهێنێـت، دەشێ هەڵسوکەوتی بە شێوەێیکی توند بە دیـار بکـەوێت هـەروەکو بـەرپا کردنـی هـەڵ چوونی ڕق و ترسان و دەربڕینیان بە هەڕەشە و ستەمی کردنەوە بـە تایبـەتی ئەگـەر دیتـی تەلەزگەێیك تەنگی پێ هەڵ چنیوە یان مافی زەوت کراوە، هەروەکو منداڵێك لە تەمـەنی چوار ساڵان دا بوور پەیوەندیی لە گەڵ خوشکی‌دا زۆر باش بوو، هەر کە پـەتووی درایـە خوشکی، ئەویش زۆر بە توندی هەڵ مەتی بردە سەری و هەموو ڕق و کینەی پێ ڕژانـد. منداڵێکی تریش لە تەمەنی سێ ساڵان دا بوو و لـە ژیانی‌دا بەختەوەر بوو، بەڵام سەر هـەڵ دانی هاو چاوێکی نۆی بە کتو پڕی سەر شانۆی ژیانی هەموو هەڵسوکەوتەکانی گـۆڕی و نەسرەوت و ترسی لێ غالب بوو دەپاڕایەوە هەر گێز لە دایکی جیـا نەبێتـەوە و ئـاوری لێ بداتـەوە و فەرامۆشـی نـەکات، دەی قیژانـد و لـە سـادە تریـن هـۆ پەسـت دەبـوو و ئارەزووەکانیشی لە ئەندازە بە دەر بوون، ئەمەشی دەکـرد بـۆ ئـەوەی سـەرنجی دایـك و باوکی بۆ خۆی ڕابکێشـێت، وەختـی میوانێـك بهاتایـەماڵیـان هـەموو لـە یسـتۆکەکانی دەخستە بەر چاوی بۆ ئەوەی ئاوری لێ بدات و خۆی پێشان بدات گوایە ئەو بە پایـە تـرە لە هاو چاوی نوێ. بەڵێ دەمار گیران زۆر تونـد دەبێـت ئەگـەر کـەم بایـەخ بـە منـداڵ بدرێت، ئەویش ڕەتەکردارێك لە ناو دەروون و هەڵسوکەوتی‌دا دەرسـکێت و هـەروەکو منداڵەکە بیەوێت پاشەکشـە بـۆ قۆنـاغی سـاوایەتی بکـات و خۆشـی لـە شـێوازەکانی‌دا بچێژێت، دەشێ داوای مەمك بکات، یان نووینــی تـەڕ بکـات یـان پەسـت و تـووڕە لـە هەڵسوکەوتی‌دا هەبێت، زۆر جاریش بە لە یستۆکەکانی دەر دەبڕێـت، منداڵێـك بووکـە

شووشه‌که‌ی فڕی دایه ناو ئاگر تاکو تاواوه، ئه‌و ساکه وتی: ئه‌مه برامه ده‌ی برژێنم.
هه‌ندێ جاریش منداڵ قینه‌ی به دژ وه‌ستانه‌وه دور ده‌بڕێت هه‌روه‌کو منداڵێك له ته‌مه‌نی پێنج سالان دابوو تووشی کۆکه هاتبوو نوژدار ڕای سپارد به ڕووی خوشکی‌یه‌وه نه‌کۆکێت، ئه‌ویش به ئانقه‌ست ده‌کۆکا تۆڵه‌ی لێ بسێنێت.

هۆیه‌کانی ده‌مارگیران لای منداڵ:-

١- وا ڕێك ده‌که‌وێت خێزانێك تاقه منداڵێکی ده‌بێت و زۆری خۆش ده‌وێن، به بێ هاو چاوی تا ماوه‌یێکی زۆر جێی ئاوڕدانه‌وه و سه‌رنج دانی دایك و باوکی ده‌بێت، به‌لام به کتوپڕی برای بچووکی هه‌موو ئاوه‌ته‌کانی ده ڕووخێنێت، چونکه هه‌ر له یه‌که‌م ڕۆژی بوونی داوای لێ ده‌که‌ن نه‌قیژێنێت و هاوار نه‌کات و به ده‌نگی به‌رز نه‌دوێت بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ینمی نوێ خه‌وی لێ بکه‌وێت، ده‌رگا و په‌نجه‌ره‌کان نه‌کاته‌وه تاکو برای بچووکی سه‌رمای نه‌بێت، جوجۆڵه‌کانی به‌ر به‌ست ده‌کرێن تاکو دایك و منداڵی بچووکی بێزار نه‌بن. دایکیش هه‌موو کاته‌کانی بۆ میوانی نوێ ته‌رخان کردووه، له‌لای منداڵی گه‌وره وایه ئه‌و دایکه دڵ نه‌رم و جه‌رگ به سۆزه‌ی جارانی نه‌ماوه و گۆڕاوه و وه‌کو پێشان نازو فیزی قبووڵ ناکات و هه‌روا ده‌زانێت به جاری پشتی لێ کراوه و ده‌رگای به‌ختی قه‌پات کراوه و ڕوو له کلۆڵی و نوشستی‌دا کردووه، ئه‌دی ئه‌مه گۆڕانێکی سه‌خت و گران نی‌یه؟ ئایا هه‌قی نی‌یه شۆڕش له دژی دایك و باوکی‌دا به‌رپا بکات؟ ئایا له عاستی میوانی ئێسك گران دا دڵی پڕ له قینه‌دا نابێت؟ به ڵێ ئه‌مه ده‌کات، یان خۆی گه‌مژه‌ڵ و گێل ده‌کات و خۆی له مه‌یدانی هافڕکی دوور ده‌خاته‌وه و ده‌رکه‌نار ده‌بێته‌وه.



٢- هه‌ڵه هه‌ره گه‌وره‌ی دایك و باوك ئه‌وه‌یه جیاوازی نێوان منداڵه‌کانیان به بۆی نه‌ژاد یان شوێنیان له زنجیره‌ی خێزان دا بکه‌ن، له مه‌ش ناله‌بارتر ئه‌وه‌یه هه‌ر یه‌کێکیان منداڵێك به نازو فیز به‌خێو بکات و سۆزو میهری تایبه‌تی خۆی پێ ببه‌خشێت، ئه‌م ڕووکاره چه‌وته‌ش ده‌بێته مایه‌ی هه‌ڵ گیرساندنی ئاگری به‌ر به‌ره‌کانێ نێوانیان و په‌نگ خواردنی ڕق و کینه له عاستی یه‌کتری‌دا و سازاندنی ئاژاوه نێوانیان به مه‌به‌ستی تۆڵه سه‌ندن، ڕووداوی که‌ساسی له ئه‌نجامی ئه‌م مامه‌ڵه‌یه‌دا له مێژوودا زۆره هه‌روه‌کو چیرۆکی ((یوسف الصدیق)) درودی خوای لێ بێت و برایه‌کانی.

٣-جارێکیان منداڵێك زۆر به توندی له بووکه شووشه‌که‌ی ئه‌دا که‌ڵێیان پرسی: بۆ چی ئه‌مه ده‌که‌یت؟ ئه‌ویش له وه‌لام دا وتی: ((ئه‌مه برای گه‌وره‌مه ده‌مه‌وێت بی کوژم.)). لێیان پرسی

بۆ چی؟ وتی: ((چونکە جلکەکانی ئەو لە بەر دەکەم.)). دەمارگیرانی ئەم منداڵە بە هۆی بە کار هێنانی کەلو پەلی کۆنی برای گەورەوەیە.
٤-هەندێ جاریش ئاگری دەمارگیران نێوان برایەکان هەڵ دەگیرسێت سەبارەت بەوە توانا یان جیایە و بە چاوی سووك تەماشای منداڵی کەم توانا دەکرێت و بە چاوی هان دان تەماشای منداڵی بە توانا دەکرێت، دەشێ منداڵی یەکەم دەرکەنار بێت و دڵ و دەروونی پڕ لە قینەدا بێت یان لە بڕی کەمایەتی‌یەکەی‌دا دەست بە ڕوو هەڵ ماڵین دەکات، کە چی منداڵی دووەم لە خۆی بایی دەبێت و بە فیزی تەماشای برای دەکات، ئەمانە هەمووی دەبنە مایەی ناکۆکی و ئاژاوە نێوان برایەکان.

چۆن چارە سازی دەمارگیران دەکەین؟

١-هەر لەو دەمەی دایك هەستی بە زگ پڕی کرد، پێویستە منداڵی گەورەشی ئاگادار بکات و هەر گۆڕانێك کە ڕوو دەدات بۆی باس بکات و لە سازدانی پێویستی‌یەکانی منداڵی داهاتوودا بەشداری بکات، ئەویش هەست بە پایەی خۆی دەکات و تێ دەگات کە دایکی ئاوڕی لێ دەداتەوە و فەرامۆشی نەکردووە و بە ڕوو خۆشی پێشوازی برای بچووکی دەکات و خۆشی دەوێت.
٢- بۆ ئەوەی منداڵی گەورە هەست بە نرخی خۆی بکات، دەبێ وەکو جاران پێویستی‌یەکانی جێ بە جێ بکرێن و لە خۆشەویستی و ئاوڕدانەوەی خزم و کەس و ناسیاوان بێ بەری نەکرێت. چەند نایابە دیدەنیاران پرسیار لە برای گەورە بکەن و خەلاتیشی بۆ بهێنن؟.
٣- پێویستە جیا وازی نێوان منداڵەکان نەکرێت و ڕێز لە کەسیەتی‌یان بگیرێت و بە پێی ڕێبازی هاو مامەڵە لە ئاوڕدانەوە و خۆشەویستی و هان دان و پۆشتە کردن و کەلو پەلی یاری و جێ بە جێ کردنی پێویستی‌یەکانی منداڵان و لاواندنیان دا بکرێت.
٤- با دایك هەندێ لە کاتی خۆی‌دا بۆ برای گەورە تەرخان بکات و لە گیرو گرفتەکانی‌دا بدوێت و یاری لە گەڵ بکات و برای بچووکیش لە باوەشی دایکی دابێت. ئەنجا منداڵی گەورە تێ دەگات برای بچووکی نەهاتووە ڕێی بگرێت و هاو چاوی لە گەڵی بکات بەڵکو خۆشی بە هاوڕێبەتی دەچێژێت و لە گەڵی دەهۆگرێت و خۆشی دەوێت.
٥- نابێ منداڵەکان کەل و پەلی یەکتر بە کار بهێنن و دەبێ فێری هەر دوو ڕێبازی ((دان و سەندن)) و ڕێز لێ نان لە مافی یەکتری‌دا بکرێن.
٦- کاتێ دەمارگیران گەیشتە ڕادەی ناحەزی، دەبێ بە بێ لایەنی ناو بژی‌یان بکەین و ڕەفتاریان لە خۆ پەرستی و لووت بەرزی و خۆ کیف دان دا پوخت بکەین و هێمنی و ئاشتی یان بۆ بخوازین و هانیان بدەین نەك سزایان و ستایشیان بکەین نەك لۆمەیان.

٧- ((غەزالی)) و ((ئبن خلدون)) و ((جۆن لۆك)) و ((هربرت)) و فرۆبل)) دەڵێن: ((ئامانجی گەورەی پەروەردە لە چاکە و دەروون پاکی و خستنی ئارەزووی مەردوم ژێر دەسەڵاتی هۆش و گەشە کردنی ڕەوشتە باڵاکان دا بە نموونەی باش دێتە ئەنجام.)). بۆیە دەبێ هەموو ئەندامانی خێزان ببنە نموونەی باشی ڕەوشتە باڵاکان، چونکە نموونەی باش باشترین مامۆستایە، قسە دەڕوات، نموونەی باش تۆمار دەکرێت و ناسڕێتەوە.

٨- پێویستە لە سەر دایك و باوك لە سەر یەك ڕێبازی پەروەردەدا ڕێك بکەون، ئەویش نە نەرمی کە بگوشرێت و نە ڕەقی کە بشکێت و دەبێ هەر دووکیان لە سەر بەدی هێنانی ئامانجیان دا سووربن، ئەویش پێ گەیاندنی وەچەیێکە بزانێت مافی چییە و ئەرکی چییە؟.

٩- ئەو مامۆستایەی بە هەر هۆیەك بێت قوتابی‌یەك زیاتری خۆش بوێت، ئەڵبەت قوتابیانی تر بە هۆی دەمارگیرەوە گیرو گرفت بۆ خۆی و بۆ قوتابی‌کە دەخوڵقێنن، هەر بۆیە پێویستە لە سەر مامۆستا خێرو بێری هەروەکو باران بۆ گشت قوتابیان ببارێنێت، هەر قوتابی‌یەك خاوەن توانا و ئاست و ئارەزوو و کەسیەتی خۆیەتی پێویستە ڕێزی بگیرێت و بەراوورد نەکرێت لە گەڵ قوتابیانی تر، مامۆستای باش داد و یەکسانی دروشمی دەبن و بە نیگای مرۆڤایەتی مامەڵە لە گەڵ قوتابیانی‌دا دەکات.



## ــ((بەندی شەشەم))ــ

## ((پەروەردەی منداڵ نێوان حەوت ساڵان و دوانزە ساڵان))

لەم قوناغەدا منداڵ ئەوەندە شایستەی سەربەستی‌یە هەتاکو دەگاتە ڕادەی یاخی بوون لە دایك و باوکی‌دا ئەگەر بەر بەستی سەربەستی بکەن، بە وتە و هەڵ سەنگاندنی منداڵانی تر بایەخ دەدات و زۆریش پەیڕەو بە بیر و ڕایان لە عاستی‌دا دەدات و بە ڕادەیێك بیر و ڕای دایك و

باوكی هەر نەیێنە بیری‌یەوە ئەگەر بیانەوێت لێیانی جیا بكەنەوە، یانەی نهێنی دروست دەكـەن و بۆ یانەكەش دڵسوزی دەنوێنن. هەست بە لێ پرسـیاریی دەكـات و دەیـەوێت سـوود لـە تـاقی كردنەوە و گۆنگەڵی ژیان دا وەربگرێت و بۆ خۆی پشتی بە خۆی ببەستێت. هەروەكو نـوژدار ((برستۆن)) وەتـەنی: ((لەشـی مـرۆڤ بـە هـەرس و نواندنـی خواردەمـەنی گەشـە دەكـات، دەروونیشی بە ئەزم و نواندنی تـاقی كردنـەوە گەشـە دەكـات.)). نیهادیشـی ئـەوەندە وریایـە هەتاكو هەست بە تاقی كردنەوەكانی ژیان دەكات و هەڵەكانی ڕاست دەكاتەوە، ڕووكاری بـۆ فێر بوون دەكێشێت و بەهرەكانی سەر هـەڵ دەدەن و زۆر بـە جوانـی ئاسـۆی چالاكی‌یـەكانی دەدرە وەشێتەوە ئەگەر لە ژێ‌یان بدرێتەوە و بۆ ئامانجێكیان ئاراستە كرایەوە.

گەشەكردنی لەشی منداڵ لەم قۆناغەدا:- لـە گەڵ ئەوەشا تەمـەنی منداڵـی حـەوت سـاڵە تـا ڕادەیێك بە تەمەنی جێگیری دادە نرێت، بەڵام هێشتا هەر هەست بە كەم تواناى لەشی دەكـات و ماوەیێكی تری دەوێت بۆ ئەوەی لـە چالاكی‌یـەكانی‌دا كارامـە تـر بێـت و بتوانێـت هـەموو ئەندامەكانی لەشی ڕێك بخات و هاو گونجاویان بكات. لەم تەمەنەدا دەتوانێت بـۆ مـاوەی نیـو كاژێری تەواو دابنیشێت، بەڵام هەڵەی هەرە گەورەی ڕژێمی قوتابخانە ئەوەیە قوتابی زیاتر لـەم ماوەیەدا لە ناو پۆل دا بـەند بكرێـت و لێ ی داوا بكرێـت بـە كشـوماتی دابنیشـێت، ئـەویش ناتوانێت ئەمە بكات و زۆر جاریش بە بزێوی لـە قەڵـەم دەدرێـت ئەگـەر بـبزوێت و بجمێت، كەواتە ئەی مامۆستای بە ڕێز ئەگەر قوتابی‌یەكانت لە میانی دە خوولەكەی دواوەی وانەكـەت دا بزرووتنەوەیان لێ بەدی كرا یان بیریان پەرت بـووەوە وا مەزانـە بزێویـت لێ دەكـەن، بـەڵكو بزانە گەشە كردنیان نەگەیشتۆتە ئەم ڕادەیە تـاكو بـۆ مـاوەی ((٤٠)) خوولـە كـە گـوێ بـۆ وانەكەت شل بكەن و وەكو پت بۆت دابنیشن. هەر لەم تەمەنـەدا دەتوانێـت هەسـتی دیـتن و بیستنی بۆ ماوەی چارەگە سەعاتێك لە سەر بابەتێكی دەست نیشان كراودا بچەسپێنێت، ئەگەر زۆر تر لـەم ماوەیـەدا داوای لێ كرایـەوە ئەڵبـەت تووشـی بـێزاری و مـاندوێتی دەبێـت. كـە پەنجەكانی سەر خامەگیر دەكات و بیەوێت وانەكانی بنووسێت شـەقڵی سـوور بـوون و سـەر گەرمیی لێ بەدی دەكرێت بە مەبەستی ئەوە بە سەر ئەندامەكانی لەشی‌دا زاڵ بێت. هـەر بۆیـە ئەركی زۆر قوتابی بێ هیوا و سست و نابووت و نائومێد دەكات، چونكـە منداڵەكـە نـاتوانێت ڕایان پەڕێنێت و دەترسێت لـە وەی سزا بدرێت. بۆیە شـارەزایانی پـەروەردە ڕابـەری مامۆسـتا دەكەن بۆ ئەوەی كەم ئەرك بۆ قوتابیی حەوت ساڵە بدات، چونكە ناتوانێت زۆری تێ بڕوانێت و هۆشی لە سەری‌دا بچەسپێنێت ئەگەر ئەركەكە زۆر بوو، كە چی ئەركی كەم بـەبێ مـاندوو بوون جێ بە جێی دەكات و فێری ووردی و ڕێكو پێكی و خاوێنی دەكـات و لـە سـەر داوێـن پاكی و ڕاست گۆیی و ڕاپەڕاندنی بەر پرسیاریی لە كاتی‌دا خـۆی‌دا ڕای دەهێنێـت. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((منداڵ پێویستی بە خۆ پەڕموونە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەرك و فەرمانـەكانی لـە

کاتی خۆیدا ڕاپەڕێنێت، پێویستە مامەڵە لە گەڵی نەکەین هەروەکو گیانەوەرێکە یان پیاوێکی گەیوە بەڵکو مامەڵەی لە گەڵ بکەین بە نیگای ئەوە منداڵە و بەس و دەرفەتیشی بدەینێ بۆ ئەوەی پشتی بە خۆی ببەستێت و بۆ خۆی خزمەتی خۆی بکات.)).
منداڵی هەشت ساڵە بە پێی خواستی کۆمەڵ و قوتابخانە خۆی دەگونجێنێت و دەیەوێت گیانی خنجیلانە بێت و خۆی لە پێناوی ئەو تیپە یاری‌یەی کە ئەندامە لە ناویدا بەخت بکات.
منداڵی هەشت ساڵە زۆر بە گەرمەوە دەیەوێت یارمەتی باوکی بدات و سەر هەڵ دانی بەهرەی لە بواری هەمە جۆرە و ڕێك خستنی کەسیەتی‌دا ئەرك دەکێشێت و بە گیانێکی سووکەوە کەمو کووڕی‌یەکانی قبووڵ دەکات و دەیەوێت بە بەهرەی نایاب لە بڕیان بکاتەوە، هەروەکو منداڵێك لە وەرزش دا پایەدار نەبێت سەبارەت بە هۆیەکانی لەشی‌یەوە، ئەنجا بەهرەی خۆی لە وانەکانی تردا بە دیار بخات، لە بەر ئەمە زۆر دەجمێت و زۆر چاپووك و چالاکە دەبێ ئێمەش هانی بدەین و ڕێز لە بەهرەکانی بنێین و ستایشی بکەین نەك تەریقی بکەینەوە و دەرفەتی بدەینێ نەك بەر بەستی بکەین و بۆ هەڵسوکەوتی نایاب و لێ هاتووش ڕابەری بکەین. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((پێویستە هەموو ڕۆژێك منداڵەکەت لە ناو هەوای بەرەڵلا و باخچە و کێڵگەکان دا وەرزش بکات، با غار بدات، با بە ئارەزووی خۆی یاری بکات، با بجمێت، شادمانە ئەگەر بکەوێت یان ئازار بکێشێت، چونکە ئەمانە فێری دەکەن چۆن بتوانێت بەر هەڵستی گەرداوی ژیان بکات و خۆشی لە سەربەستێ‌دا بچێژێت.)).
هەر لەم قۆناغەدا گەشە کردنی هەستەکانی منداڵ لە پەرەسەندن دایە و تواناشی سەر زاڵ بوون بە سەر ماسوولکەکانی‌دا زیاد دەبێتەوە و بزووتنەوەیان خۆ ویست دەبنەوە. منداڵ لە یاری‌یەکانی هەروەکو غاردان و بازدان دا توندو تیژی دەنوێنێت و ئارەزووی بۆ تاقی کردنەوە و ئیشی دەستەوە زۆرە. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((بۆ چی منداڵەکەت لە کاتێکی زووە وە لەسەر ئیشی دەست ڕانەیێت و کەرەستەی شیاو بۆ ئەم مەبەستەی ساز نەکەیت؟ ئیشی دەست تەنها مەشق بە ئەندامانی لەشی ناکات بەڵکو هۆشیشی دەجمێنێت.)). کە چی مامۆستا ((بێرت)) دەڵێت: ((منداڵ لە نێوان (٩ - ١٢) ساڵی تەمەنی‌یەوە نایابترین چالاکی‌یەکانی بە ئیشی دەست بە دیار دەخات، بە مەرجێ دەرفەتی درابێ و بەهرەکانی بەر بەست نەکران و هان دران.)).
گەشە کردنی هۆشی منداڵ لەم قۆناغەدا:- منداڵی حەوت ساڵە دەتوانێت بخوێنێت ئەگەر تەگەرەیێك قۆرت بەر خوێندنەوەی نەخات. مامۆستای دڵسۆز و هۆزان دەتوانێت ئەم تەگەرانە دەست نیشان بکات و پەنجەیان بۆ بکێشێت و بە یارمەت دانی باوکی‌یەوە هەوڵی لا بەریان دەدات. لە ڕاستی‌دا ئامادە بوونی منداڵ بۆ خوێندنەوە هەر لە ماڵەوە دەست پێ دەکات، ئەگەر دایك و باوکی خۆشی بووێن و ویژدانێکی هاوسەنگی بۆ دابنێن و بەختەوەری بکەن و

بۆ لێ کۆڵینەوە و داهێنان هانی بدەن و بۆ یاری کردن و گەڕان و سووڕان و جماندن دەرفەتی بدەن و بە ڕوو خۆشی‌یەوە وەڵامی پرسیارەکانی بدەن و گوێ لە چیرۆك و بە سەر هاتی خۆیدا بگرن و لە گەڵی بدوێن و بە قسەکانی کەیف خۆش بن و قەتیش تەریقی نەکەنەوە ئەمانە هەمووی بۆ هاو گونجان لە گەڵ شوێنەوار و تێ گەیشتنی جیهانی دەرەوە و دەست کەوتی شارەزایی و زمانی و بە کار هێنانی وشەی پاراو و بێژاندنی ڕەوان و وریا بوونەوە بۆ گرنگی خوێندنەوەدا یارمەتی دەدەن. خاتوون ((لانسی لاریك)) دەڵێت: ((ئامادە بوونی منداڵ تا ڕادەیێکی زۆر دواندن و گفتو گۆی ناو ماڵ سنووری بۆ دەکێشێت.)). هەروەها کەمو کووڕی ئۆرگانی لە لەشی‌دا قۆرت بەر خوێندنەوە دەخات، ئەگەر هەستی بیستنی منداڵ کز بوو ئەوە بە شێوەی چەوتی دەنگی پیتەکان دەبێژێت، چونکە تێ کەڵ و پێ کەڵ دەبنەوە لێی، ئەگەر چاوەکانی کز بوون ئەوە ناتوانێت بۆ ماوەیێکی زۆریان سەر پەڕاوو پەرتووك و تەختە ڕەش بچەسپێنێت. ((فرانگ)) دەڵێت: ((لاوازی گشتی هەستی دیتن بەڵگەیێکە بۆ نەگەیری پێ زانین، ئەوی بەم ڕووالەتە کلۆڵە پیتی وشەکان سەرە و ژێر دەکاتەوە، هەروەکو لە جیاتی شەکر بلێت کەشر.)). ئەگەر دووچاری زمان گیران و تێك ئالآن و قسە زمانی بوو بێت ئەوە ناتوانێت دەنگی پیتەکان بەڕەوانی دەربهێنێت، ئەو ساکە پێویستە ئەم کەمو کووڕیانە لای نوژداری پسپۆر و شارەزا چارە بکرێن. دەشێ هۆیەکانی ژێر کەوتنی قوتابی لە خوێندنەوە بە دەروون پەیوەست بن، هەروەکو قوتابی‌یەکە هەست بە دەمارگیران لە عاستی برایە بەنازەکەی‌دا بکات و بیری پەرت و بڵاو بێت و نەتوانێت مێشکی بچەسپێنێت و هەستەکانی سەر خوێندن کۆك بکات، دەشێ نەسرەوت بێت سەبارەت بەوە دایك یان باوکی نەخۆشە و دەترسێت لە وەی یەکێکیان ون بکات. هەروەها منداڵ دەمارەکانی کرژ دەبن و دەشێوێن و زمانی تێك دەئاڵێت لە کاتی خوێندنەوەدا ئەگەر بە توندی مامەڵەی لە گەڵ بکرێت. ئایا نابینین مرۆڤی زمان ڕەوان کە ڕەنگاریی ڕووداوی و ڕووژاو دەبێت زمانی تێك دەئاڵێت؟.
ناڵەبارترین مامۆستا ئەو مامۆستایەیە کە قوتابی‌یەکانی یەك لە دوای یەك دەخوێنن و جڵەویان بۆ شل دەکات و بە ئارەزووی خۆیان وشەکان بخوێنن و بەبێ ئەوەی تەماشای پەرتووکەکانیان بکەن و بۆیان ڕاست بکاتەوە، ئەڵبەت نەدەزانن بە جوانی وشەکان بخوێنن و نەدەتوانن بیان نووسن، بەڵکو تەنیا هەروەکو سروودێك بە تێ کەڵ و پێ کەڵی دەیان لێسن، بۆیە دەبێ مامۆستای خوێندنەوە زۆر بە ئارام و ئۆقرە بێت و دەرفەت بداتە قوتابی‌یەکانی تاکو وشەکان بەڕەوانی لە دەمیان دەر پەڕن و نەهێڵێت بە چەوتی و فەرمانەکەشی بە نیگای مرۆڤانە ڕاپەڕێنێت. ((ڕۆبرت ڕۆك)) دەڵێت: ((کە منداڵ دڵنیا بوو بەبێ ترس کار دەکات و سەر دەکەوێت و ڕێز لە خۆی دەنێت و خەڵکیش ڕێزی دەگرن.)). منداڵێك هان نەدرێت و فەرامۆش بکرێت و بە چەوتی فێر بکرێت و لە لۆمە و هەڕەشەی باوکی بترسێت، ئەم منداڵە

زۆر زەحمەتە فێری خوێندنەوە ببێت. منداڵی حەوت ساڵە حەز بە زانست و زانین دەکات و لەو شتانەی کە دەکەونە بەر چاوی وورد دەبێتەوە و وێنەیان دەکێشێت، بۆیە وێنەکانی زووکاری ڕیالیستی وەر دەگرن، پرسیاری زۆر دەکات بە مەبەستی ئەوە بەهرەی بە دیار بخات و ئارەزووی بۆ زانین تێر بکات، هەروەکو: بۆ چی ئەم شتە ڕوو دەدات؟ جیا وازی نێوان وەرزەکانی ساڵ چی‌یە؟ بۆ چی ئاو لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەڕوات؟ ئەمە ناوی چی‌یە؟
پرسیارە زۆرەکانی هەوڵ دانێکن بۆ پشکنین و لێ کۆڵینەوە و داهێنان، خۆشە لەلای لە نهێنی‌یەکانی گەردوون دا بتۆ ژێتەوە و شارەزای شوێنەواری خۆی ببێت و سەرنج بداتە سرووشت و تەڵەسمەکانی شیتەڵ بکات، پێویستە هان بدرێت و ئارەزووی سارد نەکرێت و کەل و پەلی یاری‌یەکانی بۆ ئەم مەبەستە شیاو بن چونکە حەز دەکات کارامە و چالاك بێت، دەیەوێت ب گورجی یاری بکات تۆڵەی ئەو ماوەی کە لە ناو پۆل دا بووە بکاتەوە، خۆزگە مامۆستاش ئەو ماوە بێ دەنگی‌یەی ناو پۆل دەبڕێت و دەرفەت ئەداتە قوتابی‌یەکانی لەشیان بزوێنن و هەڵمی بەند کراوی دەروونیان دەر بهێنن، خۆزگە وانەکەی بەڕێگای یاری کردن دەخستە ڕووەوە تاکو بە ئاسانی دێران بکرێت و چاکتر شایستەی بکرێت، هەروەها پێویستە گۆڤار و پەرتووکی زانستیی بۆ ئامادە بکەین و ڕوو کاری بۆ تۆ ژینەوە بکێشین و وەڵامی پرسیارەکانی بدەین. نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((منداڵی حەوت ساڵە ناتوانێت جیا وازی نێوان ڕووداوی ئەندێشەیی و ڕیالیستی بکات، بۆیە پێویستە لە فلیمی ترسناکی دوور بخەینەوە.)).
هەر لە بەر ئەمەیە پرسیار دەکات و دەڵێت: ((ئایا ئەم چیرۆکە ڕاستە یان هەڵەیە؟)). وا باشە هانی بدەین بۆ دەربڕینی ئەو بیرانەی کە لە ناو ئەندێشەیدا پەنگیان خواردووە و نەهێڵین ڕێژگاوی و ئەفسانە و باوەڕی پڕو و پووچ کار بکەنە سەر ویژدانی. لە ساڵی حەوتەم دا بەگەشە کردنی زیرەکیی کچ بە نیو ساڵی هۆشی لە گەشە کردنی زیرەکیی کوڕ زیاترە، لە ساڵی هەشتەم دا گەشە کردنی زیرەکیی هەردوو نەژاد هاواتا دەبێتەوە، بەهرەی کوڕ لە بیرکاری و میکانیك دا لە چاو بەهرەی کچ دا زیاترە، بەهرەی کچیش لە زمان دا لە چاو بەهرەی کوڕدا زیاترە. شارەزایانی پەروەردە دەڵێن: ئەم هۆیانەی خوارەوە کار دەکەنە سەر زیرەکیی منداڵ:-
١- هۆی کنێتی کە ڕادەی زیرەکیی دایك و باوك بۆ منداڵ دەگوازێتەوە.د
٢- ئەو نەخۆشی‌یانەی کە تووشی ئافرەتی زگ پڕ دەبنەوە بە تایبەتی لە میانی سێ مانگەی یەکەمی زگ پڕی‌دا، چونکە لەم ماوەیەدا کۆ ئەندامانی ناوەوە و دەرەوەی کۆرپەلەپێك دێن.
٣- ئەو داو دەرمانانەی کە ئافرەتی زگ پڕ بەبێ ڕابەری نوژدار بە کاریان دێنێت بە مەبەستی ئەوە هێمن بێت یان خەوی لێ بکەوێت.

٤- کەم بوونی ڤیتامین و ئاسن لە خواردەمەنیی ئافرەتی زگ پڕدا.
منداڵی هەشت ساڵەش بە ئارەزووی خۆی دەچێتە قوتابخانــە و بــە فــێر بوونیــش دڵڕوونــە، تــا ڕادەیێکی زۆریش سەر بەستە و متمانە بــە خــۆی دەکــات و هەڵسوکەوتەکانیشــی لــە جــاران هاوسەنگترن و بە پێی ئاستی خۆی شوێنەواری خۆی هەڵ دەسەنگێنێت. منداڵ لە نێــوان (٩ - ١٢) ساڵی تەمەنی‌یەوە دەتوانێت جیا وازی نێوان ڕووداوی ڕیالیستی و ئەفسانەیی بکات و لــە گەڵ ئەوە شازینده خەوی زۆرە و پڕە لە ئاوات و نیاز و ڕاو ئامانجی فراوان دا. منداڵ لە نێوان (٨ - ٩) ساڵی تەمەنی‌یەوە حەز لە دیمەنی شەڕانی دەکات، ئەمەش لە وێنەکانی‌دا دەنوێنێــت، بەڵام ئەگەر دوای ئەم تەمەنە وێنەکانی شەڕانی بنوێنن ئەمە مانای ئەوەیە منداڵێکی شــەڕانی‌یە و چارەسازی بکرێت.
هەروەها منداڵ لەم قۆناغەدا ژینا مەی پیــاوە ناودارەکــانی مێــژووی مرۆڤایــەتی دەخوێنێــت و ڕەوشتە باڵا کانیان لەناو دەرونی‌دا دەمۆرگێنێت ولاسایان دەکات. لە توانای دایــە ژیــانداریێکی زۆر دێران بکات بە تایبەتی ئەوانەی کە بە ژیانی‌یەوە پەیوەستن، بیری وورد و بە کار و تیــژە و دەتوانێت زمانی بێگانە فێر بێت و وشە و قسەی ئەستەق و هەڵبەســت و وێــژە بــە کــارزانی و ئازایەتی و چالاکانە لە بەر بکات، بۆیە ئەم تەمەنە شیاو ترین تەمەنی‌فێر بوونە، باشترین مامۆستا ئەو مامۆستایەیە کە بتوانێت بەهرەی قوتابی‌یەکانی بەرز بکات و وانەکەشی بە باشترین شێوازی وانە وتن بخاتە ڕووەوە و هۆیەکانی فێر بوون و شتی بەر هەست بۆ ئاسان کردنی وانەکە و تــێ گەیشتنی بە کــار بێنێــت. ((ژان ژاك ڕۆســۆ)) دەڵێــت: ((منداڵەکــەت فــێری واژەی ڕووت و سەخت و بێژەی ڕەقی مەکە، بەڵکو پێویستە هەموو هەستەکانی بۆ فێر بوون بە کار بهێنێت.)).
منداڵ مانای ژمارەی ڕووت نازانێت، بۆیە دەبی چەمکی ڕەنووسەکان بە بەڵگە هێنانی هەســتی بەسترێت و بیری زانستی بە تاقی کردنەوە و کردار و شتی بەر بخرێتە ڕووەوە بۆ ئــەوەی هــان بدرێت بــۆ ســەرنج دان و پشــکنین و پرســیار کــردن لــە هۆیــەکانی، منــداڵ لــە پێشــەوە بــە هەستەکانی فێر دەبێت، پاشــان بــە تــاقی کردنــەوە و کــردار و لــە دوایــی‌دا بابــەتی ڕووت و واتاداریش تێ دەگات. بۆ نموونە منداڵێك سەرنج بداتــە مۆمێــك چــۆن بــە هــۆی گەرمی‌یــەوە بتاوێتەوە ئەڵبەت ئەم منداڵە حەز بــە تــاقی کردنــەوە و تــێ ڕوانــین و لێ کۆڵینــەوە لــە نــهێنی گەردوون دا دەکاتەوە و پلان بۆ داهێنان و نایابی و شیرین کاری‌دا دەنێت و بیر لە دۆزینەوە و تۆژینەوەی زانستی‌دا دەکاتەوە، ئەو منداڵەی سەرنجی وورد بێت و لە هۆی بوونی ئــەو شــتەی سەرنجی ڕاکێشاوە بپرسێت و شایستەی وەڵامی ڕاست بێت و عەو داڵی ئەوە بێت بگاتە ڕادەی سەلماندن، ئەڵبەت ئەو منداڵە زانست و زانین ڕووکاری کێشاون و توانای پێش کەوتنی هەیــە، منداڵێکە هۆشی بە زانستی خەریك دەکات و دەیەوێت ئاسۆی چالاکی‌یەکانی بە دیار بخــات و دەیەوێت هەروەکو ئاوی کانی نوێ بێتەوە و فێر ببێت. ((ئەدیسون)) داهێنەری گلۆپــی کارەبــا

هەر لە منداڵییەوە یاری بە تێل و کەل و پەلی کانزایی دەکرد. ((جۆن وات)) لە بەر ئاگردان دانشتبو، مەنجەڵێکی چێشت لێ نان سەر ئاگر بوو، دیتی: هەڵمی مەنجەڵەکە قاپەکەی سەری دەجووڵێنێت، هەر لەو ساتەوە بیری کردەوە چۆن هێزێکی هەڵمی پەستراو دەتوانێت کالیسەیێك ببزوێنێت؟، هەر لە سەر ئەم نیگایەدا شەمەندەفەری هەڵمی داهێنا. ((نیوتن)) لە ژێر سێبەری دار سێوێك نووستبوو، دیتی سێوێك هاتە خوارێ، هەر لەو ساتەوە بیری کرد چۆن سێوەکە کەوتە خوارەوە؟ ئەوە بوو ڕێسای ڕاکێشانی دانا، هەر بۆیە ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((با منداڵەکەت بە تاقی کردنەوە فێر بێت.)). کە چی ((ماریا منتسوری)) بایەخ بە یاری داوە و بۆ فێر بوون و پەروەردە کردنی هەستەکان و گەشە کردنیان بە هۆیێکی گرنگی داناوە و بە یاری ئاسۆی زیرەکیی منداڵ بە دیار دەکەوێت. لە شەقڵەکانی زیرەکیی منداڵدا: (١) لە تەمەنێکی زووەوە دەتوانێت بیری بچەسپێنتە سەر شت و ئارەزووی گەرمە بۆ زانین. (٢) بەبێ گاگۆڵە کردن زوو دەکەوێتە سەر پێ. (٣) زوو فێری قسە کردن دەبێت. (٤) زۆر پەست دەبێت ئەگەر وەڵامی پرسیارەکانی بە ڕەوانی نەدرێت. (٥) منداڵێکی ڕیالستە زۆر بایەخ بە شتی پڕوو پووچ نادات. (٦) بەبێ یارمەت دانی کەس فێری خوێندن دەبێت. (٧) لە تەمەنێکی زووەوە لاسای گەوران دەکات. ((تۆماس ئەدیسۆن)) لە تەمەنی دەساڵییەوە حەز بە لێ کۆڵینەوەی کیمیاوی و سرووشتی دەکرد و ئەزموونگای تایبەتیی خۆی هەبوو و هەردەم خەریکی تاقی کردنەوە بوو و دایکیشی هان دەری یەکەمی بوو، هەر بۆیە دەڵێت: ((دایکم نەبووایە نەم دەتوانی گلۆپی کارەبا دابهێنم.)). مامۆستای هۆزان و دڵسۆز دەتوانێت قوتابییە هەڵ کەوتووەکانی لە میانی وانە وتنیدا سەر هەڵ بدات و بۆ پڕۆسێسی داهێنان و دۆزینەوەیان هان بدات و بابەتەکانی قوتابخانەش بە ژیانی ڕۆژانە و شوێنەواریان دەبەستێت و مەبەستی بابەتەکانیش دەپەرچێتە سەر ژیان و ڕەفتاریان و واتە ((وانە بۆ سوودە نەك بۆ تاقیمانە)). هەر بۆیە ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((شوێنەواری قوتابی پەرتووکە و بیری قوتابی فراوان دەکات، چونکە ئەوی دەی بینێت و دەی بیسێت کارێك لە ناو گیانیدا بەجێ دەهێڵێت و بە ئاسانی دەی هێنێتە بەر چاوییەوە.)). ئەگەر تەماشای دارێك بکەین لە پێشەوە دەزانین ئەوە دارە و بەس، پاشان لە بەشەکانیدا دەکۆڵینەوە، منداڵیش لەم قۆناغەدا بە شێوەی گشتی بابەتەکان دێران دەکاتەوە، بە پێی ڕای ((بستالۆتزی)) دەبێ پڕۆسێسی فێر بوون لە ئاسانی بۆ گرانی، لە بەر هەستی بۆ واتاداری، لە کردار بۆ بیر دۆزییەوە دەست پێ بکات و بە پێی گەشە کردنی منداڵ ساز بکرێت، هەروەکو بزانێت چۆن وێنە بکێشێت پێش ئەوەی بنووسێت، لە فێر کردنی زمان دا لە پێشەوە فێری ناوان بێت، پاشان سیفەتەکان و لە دواییدا ڕستەکان. هەروەها بە پێی ڕای ناوبراو دەبێ بەرنامەکان لە شوێنەواردا وەرگیرا بن تاکو قوتابی شارەزای بێت و بتوانێت بە سەریدا زاڵ بێت و بەرەو پێش کەوتنی بات.

گەشە کردنی دەروونی منداڵ لەم قۆناغەدا:- ئەوەی ڕاستی بێ منداڵ لەم قۆناغەدا زیاتر هاوسەنگە و بە پێی هەڵ وێستە کۆمەڵایەتی‌یەکان هەڵ چوونەکانی دەگونجێنێت. نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((منداڵ لەم قۆناغەدا زۆر بە تەنگ بابەتەکانی قوتابخانەوەیە هەروەکو خوێندن و نووسین و بیرکاری و پێك هاتووی ئامێرەکان و زانستی بە شێوەیێکی گشتی و گرنگ دەداتە ئەرکەکانی قوتابخانەی و ئەوەندەش بیر لە سۆزی ماڵدا ناکات ئەگەر ئەم سۆزە بە شێوەیێکی نەستی تەگەرە بەر ئەنجامی بخات.)). منداڵی حەوت ساڵە دەیەوێت لە گەڵ شوێنەواری قوتابخانەدا بگونجێت ئەگەر هان بدرێت و پشتگیری بکرێت، بۆیە دەبێ مامۆستا ڕابەری بکات و بۆ فێر بوونی ڕێنمایەکانی قوتابخانە و دەست کەوتی ژیانداری پێویست یاریدەی بدات و شوێنەواری قوتابخانەی لا خۆش بکات تاکو بچێتە دڵی‌یەوە و سەودای بێت، قوتابخانەش فێری ژیانی کۆمەڵایەتیی دەکات کە دان و سەندن و خۆشەویستی و هاوکاری و بەینەتداری و گونجان دەخوازێت و فێری داد و ڕژێم و یەکسانی و سەربەستیی دەکات و ڕێکی دەخات و کەسیەتیی گەشە دەکات، مامۆستا ((سەلامە موسا)) دەڵێت: ((لێ پرسیاریی ڤیتامینی کەسیەتی‌یە.)).باوکیش ڕۆڵێکی گرنگ لە فێر کردنی منداڵەکەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا دەبینێت، بۆیە دەبێ گفتو گۆی لە گەڵ بکات و گوێ لە قسەکانی بگرێت و فێری نەریتی دواندن و سەرخوان و ڕۆیشتن بە ڕێگای بکات، لە میانی یاری‌یەکانی لەگەڵی‌دا فێری داد و ڕەوشت پاکیی بکات و بە مەرجێ دەسەڵاتی بە سەری‌دا نەسەپێنێت و نەهێڵێت ئارەزووی بە سەر یاری‌یەکەدا بسەپێنێت وهەر دووکیانیش پەیڕەوی یاساکانی یاری بکەن، ئەمەش یاریدەی دەدات بۆ ئەوەی لە گەڵ منداڵانی تردا بگونجێت. کە منداڵان لێیان دەبێتە دەمەقاڵێ سەبارەت بە مەیە پەیڕەوی یاساکانی یاری ناکەن و یەکێك دەیەوێت دەسەڵاتی بە سەر ئەوی تردا بسەپێنێت و ئارەزووە بێ جێی‌یەکانی هەروەکو خۆ پەرستی و لە خۆ بایی بوون و خۆ گیف دان بە دیار بخات. منداڵ لە نێوان (٨ ١١) ساڵی تەمەنی‌یەوە زۆر بایەخ بە ژیانی کۆمەڵایەتی دەدات و لە گەڵ منداڵان دەگونجێت و بە ستایش و هان دانیان خۆشنوودە و گرنگ دەداتە بیرو ڕایان و زۆر هەستیارە لە عاستی سەرنج دان و ڕەخنەیان دا و زۆریش بایەخ بە ڕەخنەی دایك و باوکی نادات ئەگەر لەلای هاوڕێیانی بە پایە و سایە و بەڕێز و جێی ڕەزامەندی‌یان بێت، ئەم ڕووکارەش شەقڵی سەربەستیی منداڵ بە دیار دەخات، بۆیە دەبێ دایك و باوك یەقەی بەردن و پیرۆز بایی ئەم سەربەستی‌یە بکەن. نوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((ڕادەی گونجانی مەردوم لە ماڵ و ناو کۆمەڵ و سەر کاری‌دا بە ڕادەی گونجانی لە گەڵ هاوڕێیەکانی‌دا هەر لە ساڵانی یەکەمی تەمەنی‌یەوە پەیوەندە.)). با دایك وباوك هانی بدەن بۆ تێ کەڵ بوون لە گەڵ منداڵانی تردا و کە دیدەنی دەکەن ڕێزیان لێ بنێن و بە خەراپەش ناوی دراوسێ و ناسیاویان نەهێنن و خەڵك ڕازی بکەن و دڵی کەس لە خۆیان زوێر نەکەن و

خۆشەویستی و دۆستایەتی و یارمەت دان دروشمیان بـن و بـە پێـی ڕەوشـتە باڵاکـانی کۆمـەڵ هەڵسن و دانیشن و خۆیان لـە ڕەوشتی بەددا لا بە لا کەن. منداڵیش لاسایان دەکات، چونکـە ئەم قۆناغە باشترین قۆناغە بۆ چاندنی تۆوی چاکـە و ڕەوشـتی پـاك و دەسـت پـاکی و داوێـن خـاوێنی لـــە نـــاو دەروونـــیدا. ((ژان ژاك ڕۆســۆ)) دەڵێــت: ((بـــەکردارو نموونـــەی نایابەوەمنداڵەکەت فێریڕەوشتە باڵاکان بکە.)) کەچی ((ولیم جیمس )) دەڵێـت : ((نموونـەی باش باشترین مامۆستایە، قسەی ڕووتی بێ کردار هەروەکو با بەگوێ تێ دەپـەڕێت، کـە چـی نموونەی باش لـە ناو دەروون دا تۆمار دەکرێت و ناسرێت.)). دایـك و بـاوکی دەسـت پـاك و داوێن و خاوێن، منداڵەکەشیان دەستی پاکە و داوێنی خاوێنە، قەت مـەڵێ: ((داوێـن خـاوێن و دەست پاك بە.)). ئەگەر بۆ خۆت داوێن پیس و دەست چڵکن بییت، چونکە منـداڵ تەماشـای کردارت زیاتر لە قسەکانت دەکات، پێش زیاتر لـە ٣٠٠ ساڵ لـە مەو بەر ((تۆمـاس فۆلـر))ی ئینگلیزی دەڵێت: ((دەست پاکی گەوهەرێکی بەنرخە، بەڵام خەڵك قبووڵـی ناکـەن، چونکـە ئەو دایك و باوکەی مانای ئەم گەوهەرە نەزانن و قســە و هەڵســوکەوتیان جیـا بـن، ئەڵبـەت ناتوانن ئەم گەوهـــەرە نایابـە بخەنـە نـاو دەروونـی منداڵیـان.)). ((ژان ژاك ڕۆسـۆ)) دەڵێـت: ((منداڵەکەت تەنها درۆیێکی سپیت لێ ببیسێت، ئەوە بە جارێك هـەموو بناغـەی پـەروەردەت ڕووخاند.)).

منداڵان لـەم قۆناغەدا بە وێنەی تیپ یاری دەکەن. ((جۆرج مید)) دەڵێـت: ((یـاری بـە ڕژێـم سنوور بۆ ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەندامانی تیپەکە دادەنێت، چونکە چاوەدێری یەکتر دەکـەن و دەبێ ئارەزوویان لە ناو چوار چێوەی تیپەکەدا بتاوێتەوە.)). بەڵێ هەموویان بۆ تیپەکە دڵسوزن و خۆیان لـە پێناوی سەرکەوتنیدا بەخت دەکەن و فێری هاو کاری و گونجان دەبن. با دایـك و باوکیش هانی منداڵەکەیان بـدەن بـۆ ئـەوەی ببێتـە ئـەندامێك لـە تیپێکـی وەرزشـیدا و هـەر چەندەکیش ئازار بکێشێت و دەمەقاڵی لــە گـەڵیان بکـات و لێیـان ببێتـە نـا حـەزی بـا لێـی نەترسێن، بۆ خۆی فێر دەبێت چۆن گیرو گرفتەکانی چارەساز بکات و چۆن لــە گـەڵیان ڕێـك بکەوێت و چۆن بەر گری لە مافی خۆی و بەر هەڵستی ناخۆشیدا بکات.

لەم قۆناغەدا منداڵ لاسای دەسەڵاتی گەوران دەکات، دەر وەکو بیەوێت وەکو باوکی فەرمان بە سەر برایەکانیدا بکات، زۆر جاریش منداڵێك خۆی دەکاتە مامۆستا و هاوڕێیەکانیشـی بـە قوتابییەکانی دادەنێت و لاسای ئەو مامۆستایە دەکات کە ڕەوشت و کەسیەتی و شێوازی وانـە وتنی چووینە دڵیـەوە،دەروونناسـان دەڵێـن ((شـێوازی یـاریی منـداڵ ڕاسـترین دەربڕینـە بـۆ ئامانجەکانی دوا ڕۆژی.)). ((ناپلیون)) کە منداڵ بـوو حـەزی بـە یـاریی شـەڕ دەکـرد، خـۆی دەکردە سەر کردە و هاوڕێیەکانیشـی دەبوونـە سـەربازەکانی، ((ڕۆلان))یـش لـە قـوڕ شـتی دروست دەکرد بۆیە دەبێ هانی منداڵ بدرێت بۆ سەر هەڵ دانی بەهرە و ئـاوات و هیـوای بـە

یاری کردنی. منداڵ لە تەمەنی (٤ ٧) ساڵی تەمەنییەوە بــە ئـایینی خـۆی دەزانێـت و جیـا وازی نێوان نەتەوە و ئایین ناکات، بەڵام لە نێوان (٧ ٩) ساڵی تەمەنییەوە بیری لە ئـایین دا فراوان دەبێتەوە و پــەیرەوی ڕێنمایــەکانی دەکاتــەوە و بــە پێــی ڕۆشـناییyان ڕەفتـاری پوخـت دەکاتەوە بە تایبەتی ئەگەر لە ناو دڵیدا چەسپا بن و لە هەمان کـاتیش دا بـە نەتـەوە و ئـایینی خۆی دەزانێت، لە نێوان (١٠ ١٥) ساڵی تەمەنییەوە لە بیرو باوەڕی ئایین دا دەکۆڵێتەوە و بنچینە کۆمەڵایەکان بۆ ڕەوشتی دەپەر چینێت و هەڵســوکەوتەکانی بـە پێـی خـوو و ڕەوشـتی کۆمەڵ ڕێك دەخات، زانایانی کۆمەڵایەتی ئــەم قۆناغـە بـۆ سـۆرگ کردنـی ڕەفتـاری بـاش و ڕەوشتە باڵاکانی کۆمەڵ لە ناو دەروونی منداڵدا بە باشترین قۆناغی دادەنێن. بۆیە پێویستە لــە سەر پەروەرد کــاران خۆیـان بــە نموونــەی نایـابی ڕەوشــت پـاکی دابنێـن، خـۆ ئەگەرقسـە و کردەوەیان هاو دژ بن، ئەڵبەت منداڵەکەش تووشی ڕاڕایی و دوو دڵی دەبێت و نیهادیشــی بـە شلۆقی و شلی دەڕسکێت، ئەم نیهادە ناتوانێت جیا وازی نێوان باشــی و خـەرابی و، چاکـە و نەنکی و، سالاریی و لاساریی و، دەست پاکی و دەست پیسی و، ڕاست گۆیی و درۆ بکـات و زووش بۆ لادان پێی دەخلیسـکێت. منداڵ لەم قۆناغەدا لە لایەن ڕەگەزەوە هێمنە و لە خولەی شارراودایە و دەیەوێت ڕەوشتە باڵاکان بمژێت و ڕەفتاری بە پێی ڕۆشنایی یان بگونجێنێت.

ئەگەر منداڵ لە ساڵانی یەکەمی تەمەنییەوە خۆ پەرست بێت و بیەوێت هەموو شت بۆ خـۆی بسێنێت و زەوتی بکات و خەڵك خزمەتی بکەن و تەنیا بـیر لــە خـۆی بکـات، کـە چـی لــەم قۆناغەدا بەخشندەی زۆرە و بەڕاژە کردنی خەڵك خۆشنوودە و بە دانەوە شادە و حەز دەکات خەڵك لێی ڕازی بن و ستایشی بکەن و لە دەربڕینی بیرو ڕایدا سەربەست بێــت و بـۆ خـۆی هاوڕێیەکانی هەڵ بژێرێت. بـۆ ئـەوەی منـداڵ نیـهادێکی مرۆڤانـەی هـەبێت، بـا پـەیوەندیی دۆستایەتی لە گەڵ هەموو منداڵێکی ڕەوشت پاك دا ببەستێت بە بێ ئــەوەی ئـایین و نەتـەوە و بەرەبابی ڕەچاو بکات و قەتیش دایك و بـاوك بـە چـاوێکی سـووکەوە تەماشـای جیـا ئـایین و نەتەوەیان نەکەن، چونکە ڕەگەز پەرستی بە هەر شێوەێك بێت دەردە کوشندەی مرۆڤایەتییە و دەبێ قەڵا چوو بکرێت تاکو بە ئاشتی بژین. ویژدانی منداڵ بـە خۆشەویسـتیی دایـك و بـاوکی گەشە دەکاتەوە و داێن دەبێتەوە و پشتی بە خۆی دەبەستێت و سەر دەکەوێت و ســەرکوتنیش سەرکەوتن ڕادەکێشێت و بە شانازی بەر هەڵستی ژیان دەکات و خــەڵك ڕێـز لــە کەسـیەتیی دەنێن و خۆشی دەوێن و سۆزی دان پێ دانی خودی لەلای دەڕسکێت کـە بناغـەی دوا ڕۆژی دادەمەزرێنێت. نوژدار ((سبیتز)) و ((وولف)) بە دوو قوڵی لیستەیەك بە تێکرایـی زیرەکیـی و گەشە کردنی هۆشــی دوو کۆمەڵــەی منداڵانیـان ڕێـك خسـت، منداڵانـی کۆمەڵـەی یەکـەم بەشێوەیەکی هەمیشــەیی‌لە نـاو دەزگاتایبــەتی یــەکانی منداڵانـدا بـوون ، منداڵانـی کۆمەڵــەی دووەمیش لە ژێر ئاگاداریی دایکیان دابوون و لە دوایـیدا بـە ڕاووردیـان کـردن و دیتیـان:-

تێکرایی منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم لە میانی ساڵێك دا لە (١٢٤) پلە بۆ (٧٥) پلە و لە کۆتایی ساڵی دووەم دا بۆ (٤٥) پلە نزم بووەوە، کە چی تێکرایی زیرەکی منداڵانی کۆمەڵەی دووەم لەم ماوەیەدا گۆڕانێکی ئەو تۆ ڕووی نەدا. منداڵێك لە خۆشەویستیی دایك و باوکی‌دا بێ بەری بێت هەمیشە نەسرەوتە و هەست بە دڵنیایی ناکات و هەروەکو کوشتێکی بەزن کرد بێت و نای دۆزێتەوە و لەشتێکی شارراودا دەترسێت، ئەو منداڵە فێر نابێت چۆن لە کەڵ خۆی و خەڵك دا بگونجێت و لە کارو فەرمانی‌دا دوو دڵە و سەر ناکەوێت و هەست بە کەم پایەی خۆی دەکات و لە ئەنجام دا هەست بە بێ بەهای ژیان دەکات. زانایانی فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمریکا و سویسرا بە تاقی کردنەوە و لێ کۆڵینەوەیێکی دوور و درێژ و وورد بە دیاریان خستووە: کە بێ بەری منداڵ لە خۆشەویستیی دایکی‌دا دەبێتە مایەی ڕووخاندنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و تەندروستیی، بۆ نموونە ئەو منداڵانەی دەچاری هەناسە سواری دەبنەوە سەبارەت بە بێ بەریان لە سۆزی دایکیان زیاترن لەوانەی کە بە هۆی ترەوە دووچاری هەمان نەخۆشی دەبنەوە.

ــ گیر و گرفتەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا ــ

گیر و گرفتەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا بۆ چەند هۆیێك دەگەڕێتەوە کە بە ماڵ و قوتابخانە و کۆمەڵگاوە پەیوەستن، ئەمانەش هەندێکن:-

١- لا دانی منداڵ - هۆیەکانی - چارەسازی:- منداڵ بە سروشتی‌یەوە لاپەرەیێکی سپی‌یە، پەروەردەی خەراپ ئەم لاپەڕەیە چڵکن دەکاتەوە. هەروەکو دەروونناسی ئەمریکی ((واتسن)) دەڵێت: ((ڕەوشتی مەردوم دەست کەوتە نەك سرووشتی‌یە.)). بەڵگەی ئەم ڕایەشی ئەوەیە، دەڵێت: ((منداڵێکم بدەنێ دەتوانم بی‌کەمە نوژدار یان دز.)). منداڵ کە لە دایك دەبێت کەم شارەزایە و هێشتا بە خوو و ڕەوشتی کۆمەڵ نازانێت، هەر بۆیە ئارەزوو و خواستەکانی بێ سەر و بێ جێ و لە ئەندازە بە دەرن و هەرشتێك کەوتە بەر دەستی زەوتی دەکات و بۆ وەدی هێنانی خواستەکانی قیژاندن و پەلامار دان دەیان کاتە چەکی، خۆ ئەگەر دایك و باوکی ئارەزووە بایۆلۆژی‌یەکانی نەهێنە دی و سنوورێکیش بۆ ئارەزووی بێ سەر و بێ جێی دانەنێن، دەشێ لە ڕەفتار و نەریتی‌دا سەر فراز و بەرەڵلا بێت، واتە لە ڕەوشتی شیاو لا بدات. منداڵ حەز بە خۆ پێشان دان بە زۆری لەلای خەڵکی نەناسراودا دەکات و بە تایبەتی ئەگەر لە سۆز و میهری دایك و باوکی‌دا بێ بەری بێت، ئەمەش دەکات بە مەبەستی ئەوە سەرنجیان بۆ خۆی ڕابکێشێت و خۆی بە دیار بخات کە جێی ڕەزامەندی‌یە دەشێ ئەم خۆ پێشان دانە لە ڕێی ڕاستی لا بدات، هەروەکو قوتابی‌یەك ئاژاوە لە ناو پۆل دا بسازێنێت بۆ ئەوەی سەرنجی هاوڕێیانی بۆ خۆی ڕابکێشێت. لە ڕاستی‌دا گیانی منداڵ پڕە لە چالاکی و جموجۆڵ‌دا، ئەوەی یەکی

دەخات و ناهێڵێت بەهرەکانی سەر هەڵ بدەن سەپاندنی فەرمان و ئامۆژگاریی گرانی دایك و باوکە و بیانەوێت بە هەرەشە فێری بابەتی گران بێت و ئەویش بێزار دەبێت و پەردەی لە ڕوو هەڵ دەماڵێت و لە دژیان دەوەستێت و دەشێ تۆڵەی خۆی لێیان بە لادان بسێنێت.

بە سەر ژماردن بە دیار کەوتووە کە لە ((٧٠٪ - ٨٠٪))ی لادانی منداڵ بۆ کارەساتی خێزانەوە دەگەڕێت، ئەنجا چ بە هوی: أ- بەرەڵلا کردنەوە بێت کە منداڵ لە سۆزی دایك و باوکییەوە بێ بەری دەکات و دەبێتە هۆی پلیشاندنەوەی دەروونی و کەم ڕابەر کردنی بۆ ڕێگای ڕاست. ب- مردنیدایك یان باوك یان هەردووکیان کە منداڵ لە دڵنیایی و چێژتنیبەر سێبەریان دا بێ بەری دەبێت و لە ئەنجام دا بە تەنیا دەمینێتەوە و ناتوانێت شان بداتە بەر ژیان. حـ- زۆری ئاشووبە و ناکۆکی و ئاژاوەی نێوان ئەندامانی خێزان کار دەکەنە سەر کەسیەتیی منداڵ، چونکە ناتوانێت بەر هەڵستی ئەم هەموو ناخۆشییانە بکات. بە سەر ژماردن بە دیار کەوتووە کە هەژاری بۆ بڵاو بوونەوەی بیرو باوەڕی بە دووچەوت و بۆگەن و کۆنە پەرستی و نەفامی لە ناو خێزان دا چاووگەیێکی بە کارە، منداڵێك پێویستییەکانی لەشی فەرامۆش بکرێن، ئەڵبەت هەست بە دڵنیایی و هێمنی ناکات و لەشی بێ هێز و لاواز دەبێت و گیانی دەشێوێت و بە چاوێکی ڕەشبینی تەماشای جیهانی دەرەوە دەکات. هەروەها نەبوونی خانوو بەرەی تەندروستی دەبێتە هۆی بێ بەش بوونی منداڵ لە هێمنی وهەوایسازگاروبەرەڵلابوون ونارەحەتی داو دەشێ تووشی نەخۆشی بێت و هۆشی بشێوێت و دەروونی بهەژێت و نەتوانێت بەر هەڵستی گەرداوی ژیان بکات، هەروەها خانووی بە جەو قەڵەبالغ دەبێتە مایەی سەر شێواندنی منداڵ و پشت نەبەستن بە خەڵك و بێ بەش بوونی لە هاوڕێیەتی دایك و باوکی و بزر بوونی لە ناو دەورو بەرێك و ژیان بردنە سەر لە ناو ئاژاوە و دوور لە ئاگاداریی دایك و باوك و دەرفەت نەبوونیان بۆ شیەڵ کردنی گیرو گرفتەکانیدا، فەرامۆش کردنی منداڵ و پێویستییەکانی و نارەحەتی باری خانوو و ژێر کەوتنی لە قوتابخانەدا و ڕابواردنی کاتە بێ ئیشەکانی بە فیڕۆ، ئەمانە هەمووی پاڵ بە منداڵەوە بۆ سەر شەقام و کۆڵان و گەڕان و سووڕان و یاری کردن لە ناو هەوای سازگاردا لە گەڵ هاوڕێیەکانیدا دەنێن و لە بەر ئەمە کەم چاوە دێر دەکرێت و شتی جوان و بریقە داری سەر شەقامیش سەرنجی ڕادەکێشێت و دەشێ هەڵی بخەڵەتێنێت و تووشی لا دانی بکات.

تەلەفزیۆن و سینەما زوو هەستی منداڵ دەورووژێنن و زووش بابەتەکانیان دەچنە ناو دڵییەوە. لێ کۆڵینەوەیێکی زانکۆی ((بیل))ی ئەمریکی کە بە سەر ((١٤١)) منداڵیدا کرد بوو، بە دیاری خست کە لە (٢٠٪)ی دیاردەکانی توندی منداڵ بۆ دیتنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن دەگەڕێنەوە، ئەم لێ کۆڵەرانە ئامۆژگاری دایك و باوك دەکەن بۆ ئەوەی ببنە ڕابەرو لێك دەر

بۆ ئەو بابەتەی کە تەلەفزیۆن پێش کەشیان دەکات. هەروەها هەندێ گۆڤاری گەندە بابەت و ڕۆمانی پۆلیسی و کتێبی بازرگانی کە بیری پڕوو پووچ و نەنگ و هەڵە دەربارەی مرۆڤ و خواستەکانی هەروەکو خۆ پەرستی و زۆر روستەمی و ناپاکی دەخەنە ڕووەوە هەستی منداڵ دەبزوێنن و کار دەکەنە سەر ڕەوشتی و دەشێ لاسایان بکات و لە ڕێی ڕاستی لا بدەن.
هیچ گۆمانێکی تێدا نی‌یە کە شەڕ تەڕ و وشك پێکەوە دەسووتێنێت و ترس و لەرز دەخاتە دڵی منداڵ و لە دڵنیایی و خۆشی ژێر سێبەری خێزان بێ بەری دەکات، دەشێ باوك لە مەیدانی شەڕدا بێت و دایکیش عەودالی گوزەرانی بێت و منداڵەکەشیان فەرامۆش کرا بێت و بێ چاوە دێری مابێت و بەرەڵلا کرا بێت، لە لایێکی تریشەوە شەڕ لە کار گوزاری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و تەندروستی و دەرامەتی بێ بەشی دەکات و دەشێ فڕێی بداتە سەر شەقام و تووشی لا دان و خەراپە بێت.

چارەسازی لا دان:-

١- بایەخ بە پێویستی‌یەکانی منداڵ لە ڕووی خۆراك و جل و بەرگ و خانوو بەرە و خەرجی گیرفان دا بدرێت و شوێنەوارێکیشی پڕ لە هێمنی و خۆشەویستی و دڵنیایی و سۆزی‌دا بۆ ساز بکرێت.
٢- دەبێ دایك و باوك هەر دووکیان بەشداری پەروەردە کردنی منداڵیان بکەن و بە یەك ڕێبازی پەروەردە مامەڵەی لە گەڵ بکەن و هەر دووکیانیش لە سەر پوخت کردنی ڕەفتاری‌دا سووربن و دروشیان خۆشەویستی و ڕابەری و تێ گەیشتن بێت. پزیشك ((کولات)) دەڵێت: ((هۆی لادانی منداڵ بە پەیوەندیی دایك و باوکی بە منداڵیان وەستاوە، بە تایبەتی دەبێ هەڵ وێستی باوك لە عاستی هەموو هەڵ سان و دانیشتینیکی‌دا ئاشکرا بێت و نابێ جڵەوی بۆ شل بکات.)). بە لێ کۆڵینەوە بە دیار کەوتووە: ئەو خێزانەی باوك سەر پەرشتی دەکات خێزانێکی پتەو بە ڕژێم و ڕێکو پێکە.
٣- ئەو ناوەند ڕۆشنبیری‌یەی کە منداڵ تێ‌دا دەژێت کار دەکاتە سەر ڕۆشنبیریی منداڵەکە بۆیە دەبێ بایەخ بە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بدرێت و گۆڤاری بە سوود و پەرتووکی بەکەڵکی بۆ ئامادە بکرێت.
٤- بایەخ بە دەروونی منداڵ پێش فێر بوونی لە قوتابخانەدا بدرێت و پرۆگرامەکانی قوتابخانەش لە گەڵ ئاستی هۆش و دەروونی‌دا بشێن و پەیوەندیی دۆستایەتی نێوان مامۆستا و قوتابی هەبێت و پنچینەشی لە سەر ڕێز گرتن و خۆشەویستی‌دا بڕۆیت.

٥- پێویسته قوتابی له ماڵ و قوتابخانه و کۆمەڵدا هەست بە دڵنیایی و هان دان بکات تاکو دووچاری نەسرەوتی نەبێت و بە خۆشی و خامۆشی ژیان بگەرێتە بەر.

٢/ سەرە ڕۆیی منداڵ لەم قۆناغەدا:- زۆر جار ڕەفتاری منداڵ دەبێتە مایەی واق وڕمانی پەروەردکاران، پەلاماری منداڵی دی دەدات و ئاژاوە دەسازێنێت و ناوی خۆی بە هەڵسوکەوتە خەراپەکانی بەدد دەکات، ئێمەش سزای دەدەین و بە توندی مامەڵەی لە گەڵ دەکەین بە مەبەستی ئەوە هێمن بێتەوە و بە تورڤان و گوێ ڕایەڵ بۆ ڕژێم بێت. بە بێ ئەوەی باری دەروونی ڕەچاو بکەین و لە هۆیەکانی پەلامار دانی بتۆژینەوە و چارەسازیان بکەین. منداڵ لەم قۆناغەدا لە تافی چالاکی و جموجوڵی و چاپوکی دایە، هەر دەمێك ئەمانە بەر بەست کران ئەوە هەڵ چوونی سەرە ڕۆیی لە ناو دەروونیدا گڵ دەدات و هەروەکو هەڵم وایە چەند پەست کرا و کپ کرا ئەوەندەش زیاتر گڕ دەخواتەوە، بۆیە دەبێ دەرفەتی بدەینێ چالاکیەکانی بە یاری کردن دەر ببرێت و بواری بدەینێ بۆ گەڕان و سووڕان و تۆژینەوە و لە کارو باری ماڵدا بەشداری بکەین و بەرامبەر بە هەندێ کارو فەرمان لێ پرسراوی بکەین. لە ڕاستیدا منداڵ لەم قۆناغەدا لە ناو هاڤرکێی نێوان سەربەستی فراوان و ڕاپەرموونە بە دایك و باوکی دایە و دەیەوێت بۆ خۆی بڕیار بدات و خزمەتی خۆی بکات و ئەوانیش بە شێوەیێکی نەستی دەیانەوێت گوێ ڕایەڵ بێت و لە ژێر دەسەڵاتیان دەر نەچێت و خۆیان لە کارو باریدا هەڵ بقوور تێنن، ئەویش لە لایێك بەر هەڵستی ئەم ڕێبازە دەکات و لە لایێکی تریش متمانەیان پێ دەکات و دەیەوێت بێ ئەمەك نەبێت، ئەم کێشە دەروونیە سخڵەتی دەکات و بە سەرە ڕۆیی دەردە برێت.

منداڵێك هەست بکات کە گەوران کەم ئاوڕی لێ دەدەن و منداڵانی تریش جێی ڕەزامەندی و ئاوڕدانیانن، ئەڵبەت ئەم منداڵە هەست بە دەمارگیران دەکات و دەشێ بە مەبەستی تۆڵە سەندن لێیان پەلاماریان بدات و بێتە تەوەری ئاوڕدانەوە

بۆیە پێویستە بە هیچ کلۆجێك جیاوازی نێوان منداڵان نەکرێت، مامۆستای باش هەر وەکو باران خێرو بێرو زانین و دڵسوزی بۆ هەموو قوتابی یەکانی دەباریت، باوکی هۆشمەندیش بەیەك چاو تەماشای منداڵەکانی دەکات و سۆزیان پێ دەبەخشێت، دایکی ژیریش بەیەك ڕێباز مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانی دەکات ویەکێك بەهەر هۆیێك بێت زیاتری پەسند ناکات.دەشێ پەلاماردان بەهۆی سیفەتە کنێتەکانەوە بێت، واتە منداڵێك بەهۆی پێك هاتنی بایۆلۆژی یەوە هەڵ چوونی جۆش بێت و پەست و تووڕەش بێت. دەبی لە هەڵ وێستی وڕووژاودا دوور بخرێتەوە و هانی بدەین خۆی بە خولیاو کارو ڕاپەراندنی ئەرکەکانی خەریك بکاتەوە و بەشێنەیی ڕابەری بکەین و خۆشی لە ناو دڵی دا بچێنین وشوێنەواری ماڵ وقوتابخانەش پڕ لە دۆستایەتی وڕێز گرتن و

خوشی وهان دان وهێمن وخۆشەویستی وسۆزی مرۆڤایەتی وبەزەیی وداد ویەکسانی وچالاکی دابن وئەویش هەڵسوکەوتەکانی بە پێی ڕێبازی کۆمەڵایەتی پوخت دەکاتەوە ودەگونجێت.



٣/ سەرکەشی منداڵ لەم قۆناغەدا:-

سەرکەشی منداڵ دیاردەیێکی دژوەستانە بەرامبەر بە دەسەڵات و ڕکێفی گەورانەوە، منداڵ پێ هەڵ دەستێت بۆ ئەوەی بیروڕای بەدیار بخات و کەسیەتی بچەسپێنێت وەیان دەیەوێت پێویستی یەکانی زامن بکات ئەگەرزانی فەرامۆش کراون.

هۆیەکانی سەرکەشی منداڵ:-

١- داوا لە منداڵ دەکرێت ئەم کارانە بکات کە لە گەڵ توانای هۆش و لەشی دا شیاونینە، منداڵەکە ناڵێت: ((من ناتوانم)). بەڵکو بەشێوەیێکی سەرکەشی دەڵێت: ((نامەوێ یان کەم)) بەرەخنە لێ گرتنی زیاتر هەستی دەخرۆشێت وزیاتریش سەرکەشی دەکات.

٢- کەپەروەردکاران منداڵەکان لەگەڵ یەکتری دا بەراوورد دەکەن، ئەوانیش سەرکەشی دەکەن بۆ ئەوەی بسەلمێنن کەوا نایانەوێت لاسای کەس بکەن بەڵکو لە سەردان پێ نان بەرای ڕاستیان و زامن کردنی سەربەستی یان دا سوورن.

٣- پەروەردکاران بە توندی و هەرەشە دەیانەوێت منداڵ بە پێی ئارەزوویان هەڵ بستێت و دابنیشێت و بیروڕایان بەسەری دا بسەپێنن و خۆیان لە کاروباری دا هەڵ بقووڕتێنن و مۆڵەتی نەدەنێ شان بداتە بەرژیان، ئەویش لێ یان وەڕس دەبێت و سەرکەشی یان لێ دەکات.

٤- لەزۆربەی بارودۆخدا ئەگەر منداڵێك کەم ئاوڕی لێ درایەوە، سەرکەشی دەکات بۆ ئەوەی سەرنجی کەسانی دەوروپشتی بۆ خۆی ڕابکێشێت و پایەی لەلاین هەبێت.

٥- پەروەردکاران ئامۆژگاریی زۆر دەخەنە سەر ئەستۆی منداڵ بەرادەیێك ئارەزووەکانی بەربەست دەکەن، ئەویش بێزار دەبێت و سەرکەشی یان لێ دەکات.

*چارە سازی سەرکەشی منداڵ:-*

١- ئەو کارو فەرمانەی کەلەگەڵ توانای هۆش و لەشی منداڵ دا ناشێن پێی نەسپێرین تاکو پێ یان نەچەوسێتەوە و لێ یان بێزار نەبێتەوە.

٢- ئەستۆی منداڵ بەئامۆژگاری و فەرمانی زۆر گران نەکەین. ((ژان ژاك ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((ڕابەری و نموونەی نایابی بۆ منداڵ مامۆستانە)).

٣- نابیَ لەگەڵ منداڵانی تر بەراووورد بکرێت، خۆ ئەگـەر بەسەرکەشـی بـەر هەڵسـتی ئـەم بەراووردە نەکات، دەشیَ هەست بە کەمایەتی بکات و دەرکەنار بێت و باوڕی بە خـۆی کەم بێت، بەخشین سەربەستیی فراوان پێی باشترین پاداشتی یە، چونکە بواری دەداتیَ بـۆ ئەوەی بەهرەکانی گەشە بکەن و کەسیەتی گەشە بکات.

٤- ئەگەر هەڵەی کرد ڕەخنەی ئاراستە نەکەین، ئەگەر ژێرکەوت تیرو توانجی تـیَ نـەگرین ولە پایە و سایەی کەم نەکەین، هانی بدەین و ستایشی بەهرەکانی لە بواری تردا بکـەین، چونکە هەموو مەردومێك پێویستی بەهان دانە.

٥- بۆ ئەوەی نیشتمان پێش کەوێت و سەرکەوێت، دەبـیَ هـەموو هاونیشـتمانێك بـە مـاف ئەرکی خۆی بزانێت، ئێمەش دەبیَ بە ڕێبازێکی ڕاست و ڕووخسـارێکی گەشـبینی فـێری منداڵەکانمان بکەین چۆن لـە کاتی خۆی دا بە کارو فەرمانیان هەڵ بسـتن و کـەی داوای مافیان بکەن؟ ئەوساکە هەڵسوکەوت و ئارەزوویان بەپیَ خواستی کۆمەڵ پوخـت دەکـەن و لەگەڵی دەگونجێن و ڕێز لـە مافی خەڵك دەگرن و بەداد و یەکسـانی دەزانـن و دەبنـە ئەندامێکی کاریگەری نیشتمان.

٤/ درۆی منداڵ  هۆیەکانی/ چارەسازی:- درۆ دیاردەێکـە لـە لادان و ڕەفتارێکـە دارانـە، ناپاکی و تەڵەکەبازی و چەقاوە سوویی ڕێڕەوینە، مەردومی درۆزن زمان شڕو ڕەوانە بۆ ئـەوی لە ئەندێشە بەدد فەرەکەی دادەرپرێت. درۆ ڕەفتارێکی دەست کەوتە بە ڕێبـازی پـەروەردەی چەوت ڕەگی دادەکوتێت، منداڵێك لە لای ئاشکرابێت، ئەوانەی مامەڵـەیان لەگـەڵ دەکـات درۆزنن، ئەڵبەت ئەم ئەریتە بەددەیان لیَ فێر دەبێت و بۆ وەدی هێنانی مەبەسـتەکانی بـەکاری دێنێت، هەر وەکو کورد وەتەنی: ((گیان لەسەر بنچی خـۆی شـین دەبێتـەوە)). بـاوکێك بـە منداڵەکەی بڵێت: ((هەستە جلکەکانت بگۆڕە بـابچین بـۆ سـینەما، کـەچی ڕێگـای نـوژدار بگرێتە بەر)). منداڵەکەش گومان لە باوکی دەکات و باوەڕی پیَ لەق دەبێـت و فـێر دەبێـت چۆن خەڵك بە درۆ و دەلەسە هەڵ بخەڵەتێنێت. دەشیَ منداڵێك هەست بەکەمایەتی و لـەبری ئەم هەستە دەست بە خۆ هـەڵ کێشـان بکـات بەمەبەسـتی ئـەوە سـەرنجی خـەڵك بـۆ خـۆی ڕابکێشێت و خۆی بکاتە تەوەرەیان، هەر وەکو منداڵێك بە منداڵێکی تر نەوێرێت و ستایشـی خۆی بکات و لە بری ئەم کەمایەتی یەی خۆی هەڵبکێشێت. دەشیَ منداڵ بە هـۆی کشـانەوە لە لیَ پرسیاری دا درۆ بکات، هەروەکو منداڵێك ئەرکەکانی فەرامۆش بکات و ژێربکەوێت و هەنجەت بگرێت و بڵێت: ((مامۆستا منی خۆش ناوێت، یان پرسیارەکان زۆر گران بـوون، یـان کەس لەو مامۆستایە

ناگات    )). ئەگەر باوەڕ نێوان ئـەندامانی خـێزانێك وون کرابێـت و دەسـت پـاکی نـەبوو، منداڵەکەش پەنابەر خووی بەدد دەبات و هەروەکو ڕۆژانەی لە هەر دوو دایك وباوکی یـەوە

وەبگرێت و حاشاو درۆ بکات کەوەری نەگرتووەز قوتابی یەك ئاژاوەێك لە ناو پۆل دا بسازێنێت و مامۆستا لە ناوی تاوان کارەکە بپرسێت و قوتابی یەکان چاویانی لیّ پۆشێت لە ترسی ئەوی بەر سزا نەکەوێت ئەمانە هەموویان بە هۆی دڵسۆزی بۆ قوتابی یەکەوە درۆیان کرد. ئەگەر جیاوازی نێوان مندالاچن بکرێت هەر وەکو یەکێکیان زیاتر خۆشەویست بێت و زیاتر جێی ئاوڕدانەوەو ڕەزامەندی یان بێت، ئەم چەشنە مامەڵەیە ئاگری دەمارگیران لە نێوانیان دا هەڵ دەگیرسێنێت، دەشیّ بووختان بەیەکتر بکەن، هەر وەکو مامۆستایەك لەگەڵ قوتابی یەکی زیرەگ بدوێت و زیاتر ئاوڕی لیّ بدات، قوتابی یەکی تریش کەلەم چەشنە مامەڵەیە بیّ بەری یەو ئاشووبەێکی بۆ بسازێنێت بە مەبەستی ئەوە بەر سزا بکەوێت و سوێندیش بخوات خەتای نیە. هەندیّ جاریش منداڵ نکوڵی لە تاوانەکەی دەکات بۆ ئەوەی بەر سزا نەکەوێت بە تایبەتی ئەگەر بترسێت و باوەڕی بەخەڵك کەم بێت، دەشیّ منداڵێك ئەندێشەی بە پیت وفراوان بێت و چیرۆکی وارێك بخات هەر لە ڕیالیستی دا نەبێت، لێرەدا ئەو منداڵە بە هۆی ئەندێشە بەپیتەکەی درۆ دەکات.

*چارە سازی درۆی منداڵ*:- لە پێشەوە دەبیّ لە هۆیەکانی درۆ بتۆژینەوە و لایەن بەرین، ئەگەر منداڵەکەت درۆی کرد، تۆش درۆیەکە ئەوەندە گەورەی مەکە بەرادەیێك سەری بشێوێت، وا باشە بە هێمنی و ئارامی و شێنەیی لە هۆیەکە بتۆژێتەوە، ئەنجا دەشیّ هۆیەکە ترس، هەست بە کەمایەتی، دەمارگیران، نەسرەوتی، یان خەیاڵی بەپێت بێت لە هەمان کاتیش دا منداڵەکە دڵنیا بکە ئەگەر دان بە هەڵەی بنێت و بەڕاستی بدوێت سزای نادەیت، واتە ((ڕزگاری لە ڕاست گوتی دایە)). منداڵەکەش تیّ دەگات کە ڕاست گۆیی ڕەفتارێکی مەردانەو مرۆڤایەتی و کەڵەمێری یە، بە مەرجیّ بۆ خۆت ببیتە نموونەی نایابی دەست پاکی، ڕابەری و ئامۆژگاری کەڵکیان چی یە ئەگەر بە کردار نەیەنە کایەوە. ((سپینۆزا)) دەڵێت: ((منداڵەکەت بە هان دانی گیانی یەوە فێری ڕاست گۆیی بکە بۆ ئەوەی پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ خەڵك دا بە دڵ و دەروونێکی پاکەوە ببەستێت)). کەچی ((کیث میلر)) دەڵێت: ((سەپاندنی دەسەلاّتی گەوران بەسەر کۆمەڵ دا و بەکارهێنانیان شێوازە چەوتەکانیان لە ژیان دا دەبنە مایەی خولقاندنی نەوەێکی درۆزن بەبیّ ئەوەی بزانن کە درۆ دەکەن)). کەی منداڵ لە ناو خێزان دا هەستی بەدڵنیایی و هێمنی و خامۆشی و باوەڕی و دڵپاکی و دڵسۆزی و خۆشەویستی و بەینەت داریی و سۆزی مرۆڤایەتی و ڕێز گرتن وشان و شکۆیی و داوێن خاوێنی و دەست پاکی وچاکەو پیاوەتی کرد ئەوساکە چۆن پەنابەرناپاکی و درۆ و تەڵەکەبازی و ڕق و قینەو تۆڵەسەندن دەبات؟ ئەگەر بەڵێنت بە خەڵك و منداڵەکەت-دا- هەردەم خاوەن بەڵێنی خۆت بە، هەر وەکو کورد وەتەنی ((سەرم بچیّ قسەم نا چێت)). منداڵەکەش لاسات دەکاتەوە. هەر وەها دەبیّ منداڵ بزانێت چۆن جیاوازی نێوان ڕیالیستی و ئەندێشە بکات،

ئەگەر پرسی ئەم چیرۆکە ڕاستە یان ڕاست نی یە؟ دەبیٚ وەلاٌمی ڕاستی بدەینەوە و لەهەمان کاتیش دا هانی بدەین بۆ ئەوەی چیرۆك لە ئەندێشە بە پیتەکەی دابنێت بە مەرجیٚ لەنەدیوی وریژگاویی دوور بخرێتەوە، وا باشە چیرۆك لە ڕوو داو دیاریدەکانی کۆمەلاٌیەتی دابنێت و پالٌەوانەکانیش سیفەتی مرۆڤایەتیان هەبێت.

٥/ هەست کردن بە کەمایەتی/ هۆیەکانی/ چارە سازیان :- هەست کردن بە کەمایەتی بنەڕەتی هەموو ئالٌۆزێکی دەروونی یە، لەدیاردەکانی ترس و گۆشەگیری و بەدگومان و دوو دلٌی یە، ئەگەر مندالٌێك دووچاری ئەم نەخۆشی یە هات، هەردەم لە هەموو شتێکی ژێر پەردە دەترسێت و ئیش وفەرمان ناگرێتە دەست و هەست بە لیٚ پرسیاری ناکات، ئەگەر لە ژیان سەر نەکەویت ئۆبالٌی تاوانەکە دەخاتە سەر ئەستۆی خەلٌك و هەر لەبەر ئەمەیە سست وبێزارە و دەروونی پڕە لە غەم و پەژارە و لە ڕادە بەدەر هەستیارە، هەر فسکەیێك لە لایەن خەلٌکەوە کرا، وا دەزانێت باسی دەکەن، بۆیە نیازی چلٌکن دەبێت و بەدەگمەن لە ناو کۆمەلٌ دا دەگونجێت و دەهۆگرێت، چۆن هەست کردن بە کەمایەتی لە لای مندالٌ دەڕسکێت؟ کە مندالٌ خۆی لە گەلٌ دایکی و باوکی دا بەراوورد دەکات، خۆی بەلاوازی و بچووکی دێتە بەر چاوی و ئەوان بە هێزو گەورە و بۆ دابین کردنی پێویستیە کانی پشتی پیٚ یان دەبەستێت و لای وایە پێویستە هەردەم بەند وکۆتەیان بێت و نازانێت گەورە دەبێت و پشتی بە خۆی دەبەستێت، ئەم ڕووکارەشی وای لیٚ دەکات هەست بە کەمایەتی بکات، هەر لە بەر ئەمەیە لاسایان دەکات و خۆی لە کار وفەرمانیان دا هەلٌ دەقووڕتێنێت هەر وەکو بلٌێت: ((منیش دەمەوی گەورە بم)). کە واتە هەست کردن بە کەمایەتی لای مندالٌ هەستێکی خۆڕسکە، ئەم هەستەش زیاتر تەشەنە دەکات و دەپەڕژێت بە تایبەتی ئەگەر مافی سەربەستی نەدرێتی و بە چاوی هان دان تەماشای نەکرێت، خۆ ئەگەر کەموکووڕی لە لەشی دا هەبێت هەر وەکو ((گێری، شەلی، زمان لالٌی، فسەزمانی )))، یا خود نارێکی یەك لە لەشی دا هەبێت،هەر وەکو: ((کەتەیی، لاوازی، بالاٌ درێژی یان کورتی ڕێزپەڕ )) دەشیٚ ئەم هەستەی ببێتە هاو شانی ئەگەر بە پێی توانا ئەم کەم و کووڕی یانە چارە نەکرێن و مندالٌەکە هێمن نەکرێت.زۆر جاریش پەروەردکاران بەچاوی سووك و نزمەوە تەماشای مندالٌ دەکەن و لە تواناو بەهرەی کەم دەکەن و ڕەخنە لە ئیش و کاری دەگرن و هانی نادەن و پشتی بەردەدەن و ڕێزی ناگرن وهیمەت و سەرگەرمی و هەولٌ دانی سارد دەکەن. بۆ نموونە مندالٌێك وێنەیێك بکێشێت و وێنەکەپێشانی باوکی بدات و باوکیش بە پێی بۆ چوونی خۆی کارەکەی هەلٌ بسەنگێنێت نەك بە پێی بۆ چوونی مندالٌەکە، ئەلٌبەت ئەم مندالٌە بەهرەی لەم هونەرەدا پەرە ناسێنێت، بەلٌکو هیمەتی سارد دەبێتەوە و دەشیٚ وازی لیٚ بهێنێت، چونکە هەر بەهرەیێك بۆ سەر هەلٌدانی هان نەدرێت لە جیٚ خۆی دەفەوتێت. لە مەش خراپتر ئەوەیە لە پێش خەلٌك

لزمەی منداڵ بکرێت و ڕەخنەی لێ بکیرێت و پایەی نزم بکرێت، هەر وەکو قوتابی هەڵە بکات و مامۆستاش لە جیاتی ئەوە هەڵەکەی بە نەرمی ڕاست بکات، تەریقی بکات، ئەم قوتابی یە هەستی دەخرۆشێت و دەروونی دەچوورزێت و بەهرەی دەفەوتێت و شەرم دای دەگرێت و گۆشەگیر دەبێت و خۆی لە وانەکەی دەکێشێت و بەشداری ناکات لەترسی ئەوە جارێکی تر تەریق نەبێت و لە ئەنجامی ئەم مامەڵەدا ئەم منداڵە هەست بەکەمایەتی دەکات. دەشێ قوتابی یەك لە هەموو قوتابیەکان زیرەکتربێت و ئەوانیش لێی بەدەمار بن و بە چاوی چڵکنەوە تەماشای بکەن و ئەویش نەتوانێت لە گەڵیان مامەڵە بکات و تووشی ناخۆشی ببێت و لەعاستیان دا هەست بەکەمایەتی بکات بەتایبەتی ئەگەر تەمەنی لە ئەوان بچووکتر بێت، هەر هەمان منداڵ هاو گونجاوی لە گەڵ منداڵانی هاو تەمەنی دا کز دەبێت چونکە لە ئەوان زیرەکترو بەرێی وجێترە. ئەگەر قوتابی ی لەوانەکانی دا دوا بکەوێت وخرایە پۆلێك گشت قوتابی یەکانی بە تەمەن لە ئەو بچووکتر بوون، ئەڵبەت ئەم منداڵە هەست بەکەم پایە و سایەی خۆی دەکات ودەزانێت بەهرەی کزە و باوەڕی بە خۆی ون دەبێت وبە تایبەتی ئەگەر مامۆستاو قوتابی یەکان گاڵتەی پێ بکەن و تیرو توانجی تێ بگرن و بە چاوی سووکەوە تەماشای بکەن و ئەم هەموو هەڵچوونانە لە ناو دڵ و دەروونی دا کپ دەبنەوە و کار لە پاشە ڕۆژی دا دەکەنەوە. دیسان هەرەشە کردن لە منداڵ بە مەبەستی ئەوە گوێ ڕایەڵ بێت و سەربکەوێت، ئەم منداڵە هەست بە نابووتی و پلیشانەوەی گیانی دەکات و ترسنۆك و دەرکەنار دەبێت و شەرم تارمایی بەسەری دا دەکێشێت و خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەکێشێت و هەست بە کەمایەتی دەکات، هەر وەها منداڵێك دیمەنی دەرەوەی شڕو ناڕێك بێت و خەرجی ڕۆژانەی وەکو هاوڕێ یەکانی نەبێت، یان خێزانەکەی بەدد ناو بێت، ئەمانە هەمووی دەبنە مایەی هەست کردن بە کەمایەتی. بۆ ئەوی منداڵ هەست بە کەمایەتی نەکات ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە دەخینە بەر چاوی پەروەردکاران:-

١)- ڕێز لە کەسیەتی منداڵ بنێین و دان بە توانا و بەهرەکانی بنێین.



٢)- هانی بدەین بۆ ئەوەی پشتی بە خۆی ببەستێت و بەو کارانەی کە لە توانای داین هەڵ بستێت و فێری بکەین چۆن خزمەتی خۆی بکات.

٣)- دەرفەتی بدرێتێ بە ئارەزووی خۆی چالاکی یەکانی ڕاپەڕێنێت و بە بێ ترس یاری بکات، ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((ئەگەر منداڵ ڕۆژی سەد جار بکەوێت، ئەوە باشە چونکە فێر دەبێت چۆن هەڵ بستێت و ڕا بکات و بە سەربەستی دڵنیایە، پەکی بەم ئازارەی کەتووشی دەبێت ناکەوێت)). کەچی دکتور ((عبد العزیز القوصی)) دەڵێت: ((ئەم ئازارەی کە لەمیانی یاری و پشکنین و داهێنانی دا تووشی منداڵ دەبێت، ماوەیێکی کورت دەخایێت، کەچی زامی دەروون بەردەوام دەبێت و تا دواڕۆژی ژیانی هاوڕێ یەتی.))

٤)- ئەگەر کەمو کووڕی لە لەشی منداڵ دا هەبوو دەبێ چارەی بکرێـت، وا باشـە دایـك و باوك سۆزی لە ئەندازە بەدەری بۆ نـەنوێنن وزۆریـش ئامۆژگـاری نەکـەن و تـێرو توانجـی تـێ نەگرن و کەمو کووڕی یە کانشی بەبیر نەهێنن.

٥)- کە پۆلەکان ڕێك دەخرێن پێویستە توانای هۆش و تەمەنی قوتابی یەکان ڕەچـاو بکرێـت تاوەکو هاوگونجان وهۆگری نێوانیان هەبێت.

٦)- نابێ وانەی تایبەتی بە قوتابی بدرێت تەنها لە بـاری ناچـاری یـەوە نـەبێت، بـەڵکو هـان بدرێت بۆ خۆی فێر بێت و سەربەستی بیرو هۆشی هەبێت. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێـت: ((ئـەو وانانەی قوتابی خۆی پێ یانەوە ماندوو کـردووە فێریـان دەبێـت و لـەبیریان ناکاتـەوە و لـەناو مێشکی دا دەچەسپێن زیاتر لەوەی یەکێك ڕاڤە کردبێت.))

٧)- کارێکی مرۆڤانەیە ئەگەر لە هەڵەکانی ئەو منداڵەی کە هەسـت بـە کەمایـەتی دەکـات بپۆشین و زۆری چاوەدێر نەکـەین و هێمـن و دڵنیـایی و خامۆشـی بـە منداڵەکـە ببەخشـین و ستایشی بەهرەکانی بکەین وپێی بڵێن: ((هیچ کەس لە کێتی دا لە هەموو بوارێك دا تەواو نیـە، تەواوی تەنها بۆ خوای مەزنە)).

٦/ هەڵهاتنی قوتابی لە قوتابخانە/ هۆیەکانی/ چارەی:-

((سامان)) قوتابی یەکی پۆلی یەکەمی سەرەتایی یە، دوو سێ ڕۆژ چووە قوتابخانە و ئیـتر لێ بـزر بوو، دوای ماوەیێك باوکی بە گریانەوە هێنـای و خـۆی لـە دەسـتی یـەوە دەپچڕانـد، چونکـە منداڵێکی شەرمنە و ناتوانێت لەگەڵ شوێنەواری قوتابخانـەدا بگونجێـت. ((ئـازاد)) یـش قوتـابی یەکی پۆلی چوارەمە، ڕۆژێـك دەچێتـە قوتابخانـە و ڕۆژێکـی تریـش لێ بـزر دەبێـت، ((ئـازاد)) دەڵێت: ((شوێنەواری قوتابخانە، زۆر سەخت و گرانە، بە هەڕەشـە و سـزادانە.)). ((نـەوزاد)) یش قوتابی یەکی پۆلی شەشەمە، پەرتووکەکانی بە دەستیەوە دەگرێت، لـە جیـاتی ئـەوە بچێتـە قوتابخانە لەگەڵ هـاوڕێ یـانی تـۆڕی و خوێـڕی تـاکو دەوام کۆتـایی پـێ هـات دەگـەڕێت و دەسووڕێت، ئەنجا بە لەنجـەو لارەوە بـەرەو مـاڵ دەڕوات، دایـك و باوکیشـی هـەروا دەزانـن

چوویتە قوتابخانە، ئەمانەی سەرەوە چەند نموونەیێك لە دیاردەی هەڵ هاتنی قوتابی لـــە قوتابخانـە بوون، با لـە خوارەوە باسی هۆیەکانی ئەم دیاردەیە بکەین:-

١) منداڵ کە لەشوێنەواری ماڵ دا بۆ قوتابخانە دەگوێزرێـــت، سـەرنج دەداتـە شـوێنی نـوێ و دەزانێت وەکو شوێنەواری ماڵ هەست بە ئاوڕدانـەوە وخۆشەویسـتی وسەربەسـتی ناکـات وپەیوەندی توندیش نێوان ئەندامانی نی یـــە و ڕژێمێکـی گرانیـش سـنوور بـۆ خواسـت و ئارەزوو وجوجۆڵی داناوە، ئەنجا بێزار دەبێت و لـەگەڵی ناگونجێت ولێ بزر دەبێت.

٢) ئەو بابەتانەی کە قوتابی لـە قوتابخانە دەخوێنێت لـە ژیانی ڕۆژانەی دوورن و بـــە ویژدانـی نابەسترێن و دەرفەتی نادەنێ بۆ داهێنان ودۆزینەوە وتۆژینـــەوە و بـۆ لـەبـەرکردن دانـراون وسەرکەوتنی لـە قوتابخانە بە لـەبەرکردن وبە بیرهاتنیان پـەیوەندە، هـەردەمێك فەرامۆشـیان بکات وئەرکەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ جێ بە جێ نەکات، ئەوە ژێر دەکـەوێت وهەسـت بەکـەم پایەی دەکات وبێزار دەبێت ولێ بزر دەبێت.

٣) گرانی بابەتەکان و کەم بایەخدان بە خستنە ڕوویان و کەم گرنگ دان بە دەروونی منـداڵ دەبنە مایەی دێران نەکردنیان و بێزاربوونی قوتابی، ئەنجا دەروونی پڕ لـە کینـە بـۆ سـفن و مامۆستا و قوتابخانەکەدا دەبێـــت و لێ بـزر دەبێـت بەتایبـەتی ئەگـەر قوتابخانـە بـە تونـدی مامەڵەی لـەگەڵ بکات.

٤) ئەگەر قوتابخانە بە پێ پلان و ڕژێمێکـــی چەسپاو نـەڕوات و بایەخبـە دیـاردەی بزربـوون نەدات و جڵە و بۆ قوتابی یەکان شل بکات و دایك و باوکیش لـە منداڵەکەیان نەپێچنەوە وبە بەهای قوتابخانە نەزانن ئەڵبەت قوتابی ڕژێمی قوتابخانە دەخاتە پشت گوێی ولێـــی بـزر دەبێت.

٥) ئەگەر قوتابی یەك بەبێ پێ ڕەوابینین بۆ پۆلی نوێ گوێزرابێت و نەتوانێت دێرانی وانەکانی بکات و ژێر بکەوێت و بەر تیرو توانجەی هاوڕێ و مامۆستا و برایەکانی بکەوێت ئەڵبـەت ئەم قوتابی یە بێزار و گۆشەگیر دەبێت و ناتوانێت بەر هەڵسـتی ئەم بـارە ناسـازە بکـات و لێی دوور دەکەوێتەوە، واتە لـە قوتابخانە بزر دەبێت.

٦) دەشێ قوتابی یەك زیرەگ و بلێمەت و بەتوانا بێت، بەڵام لـەبـەر هـەژاری و کەساسـی دا پاش دەوامی قوتابخانە کار دەکات و یاریدەی باوکی دەدات، ئەنجا ئەرکـەکانی قوتابخانـەی فەرامۆش دەکات و سەرناکەوێت و لـە قوتابخانە بزر دەبێت.

٧) دەشێ باوك لـە بەر خەریك بوونی بە گوزەرانی دا ئاگای لـــە منداڵەکـەی بـبڕێت و سـەر شەقامیش بریقـەدارو ڕاکێشـەرە و هـاوڕێی خـەراپیش تووشـی بێـت و فێری چەپـەڵی و سەرکەشی و لاساری و سەرپێچی و گەڕان و سووڕانی بکات و ئاگای لـە فەرمانەکانی دا ببڕێت و ژێر بکەوێت و لـە قوتابخانە بزر بێت.

**چارەی هەڵهاتن لە قوتابخانە:-**

١) پێویستە پرۆسێسی فێر بوون بە پێویستی یەکانی منداڵ ببەسترێت و لەگەڵ ئاستی هۆش و توانای شیاو بێت و بایەخبە دەروونی بدات، هەر بۆیە دەبێ بەرنامەکانی قوتابخانە لە شوێنەواری قوتابی وەرگیرابن و بایخ بە زانست و ئەزموون و کردار زیاتر لە بیردۆزی و زارەکی و ویژەیی بدرێت، هیچ کەسێك فێرنابێت ئەگەر کار نەکات و سەرنج نەداتە بابەتەکە و نەخرێتە بەرچاوی و تاقی نەکاتەوە، ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((پێویستە لەسەر ئەمیل وەکو جوتیار کارمەندو وەکو فەیلەسوفیش بیکار بێت.)). کەچی ((سۆزان ئابزکس)) دەی وت: ((پێویستە ئارەزووەکانی منداڵ بینە رۆشنایمان کە بەرنامەکانی قوتابخانە دادەنێین و بابەتەکانیشیان بە پێ ئاستی زیرەگی منداڵ هەڵ بژێرین)). واتەژیان بێتە قوتابخانەی گەورە و فێری قوتابی بکەین چۆن سوود لە ژیان دا وەربگرێت و لێ فێربێت.

لەبەر ئەمە مامۆستا بڕ بڕەی پشتی قوتابخانەیە، بۆیە دەبێ نموونەی ڕەفتار باشی و هەڵسوکەوتی بەجێ و ڕێ و یەکەم پارێزەری ڕەوشتە بلاکانی کۆمەڵ بێت، هانی قوتابی بدات پێش ئەوەی لۆمەی بکات و سزای بدات، پەیوەندی پتەوی لەگەڵ دا ببەستێت و ڕاگری خۆشەویستی و تێ گەیشتن و ڕێز لێنان بێت بۆ ئەوەی خۆشی بووێت و لەگەڵ وانەکەی بلوێت و بەشداری گفتو گۆی ناو پۆل بکات. ((ولیم جێمس)) دەڵێت: ((مامۆستای ڕوو خۆش بەرهەمی لە مامۆستای ڕوو گرژ و پەست و تووڕە زیاترە)). هەر وەها دەبێ جێ باوەڕ و لە کارو فەرمانی دا شارەزاو ڕۆشنبیر بێت تاکو قوتابی یەکانی سوود لە شارەزایەکانی وەربگن و پشتیانی پێ ببستن، ((ولیم جێمس)) دەڵێت: ((مامۆستای کارزان و دڵسۆز و بلیمەت چاوی قوتابی یەکانی دەکاتەوە، سەرنجیان بۆ وانەکەی ڕادەکێشێت و وانەکەی لە لایان ئاسان و خۆشە و هەست بە بێزاری ناکەن و بۆ دەست کەوتی زانین و زانست هاو چاوی یەکتر دەکەن)). مامۆستای کارمەند و زیرەك وچالاك پۆلەکەی دەکاتە شانەیێك لە چالاکی و هیچ قوتابی یەکیش فەرامۆش ناکات، هانی قوتابی یەکانی دەدات بۆ بیرکردن و لێ کۆڵینەوە و پرسیار کردن، وانەکەشی بە تازەترین شێوازی وانە وتن سوودترینهۆیەکانی فێربوون دەڵێتەوە و لە پێناوی پێ گەیاندنی وەچەیێکی ڕۆشنبیردا هەر وەکو مۆم دەتاوێتەوە و لە ماڵ و قوتابخانە و کۆمەڵ دا بە هەموو مانای وشە مامۆستایە هەر وەکو ((ولیم جێمس)) وەتەنی: چارە نووسی میللەت بە دەست ماموستایانە، دەبێ بۆ ڕووخاندنی کۆتە پەرستیو نەهێشتنی نەفامی تێ بکۆشن و نەوەی نوێ بە زانست و ڕۆشنبیری چەك بکەن.)).لە یەکێك لەزانکۆیەکانی ئەمریکاوە لێ کۆڵینەوەیێك کراو (١٤) هەزار قوتابی تێیدا بەشداریان کرد، قوتابییەکان ئەم سیفەتانەی خوارەوە بۆ مامۆستای سەرکەوتوویان داناوە : ١- ڕووکاری هاوکاریو دیموکراسی هەبێت. ٢- بەزەیی بەخەڵك

بێت و ڕێزی هەستیان بگرێت. ٣- دووربین و پشوو درێژبێت و مامەڵەی لە گەڵ خەڵك باش بێت. ٤- دیمەنی دەرەوەی ڕێك و لێ وەشاوەبێت. ٥- لەویژدانی‌دا دانی وەیەكسانی هەبێت. ٦- گیانی پاك و خنجیلانە بێت. ٧- ڕەوشتی چەسپاوی هەبێت. ٨- ڕێزی قوتابی بگرێت و ستایشی بكات. ٩- لە وانە وتن دا كارامە بێت.

(٣) پێویستە هاوكاری نێوان ماڵ و قوتابخانە پتەو بێت و هەردووكیان بەشێوەیێكی پەروەردانە چارە سازی گیروگرفتەكانی منداڵ بكەن، باوك پشت بە قوتابخانەی كوڕەكەی‌و پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ دەستەی ماموٚستایان دا ببەستێت و لە سەر یەك ڕێبازی پەروەردەدا ڕێك بكەون بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان دەسەڵاتی ماڵ وقوتابخانە نە بێت. پێویستە لە سەر بەڕێوەبەری قوتابخانەش تۆماری بزربوون لە یەكەم ڕۆژی كردنەوەی قوتابخانەدا بەكار بێنێت و لەقوتابی بزریش بتۆژێتەوە وئاگاداری باوكی بكات و هەردووكیان واتە بەڕێوەبەری قوتابخانەو باوك چاودێری بكەن نەوەكو فڕێ بدرێتە سەر شەقام و بەرەنگاریی هاوڕێی بەدخووبێت.

(٤) دەبێ شوێنەواری قوتابخانەو ماڵ لە لایەن سازكردنی دڵنیایی و خامۆشی‌و سەربەستی‌دا هاو شێوە بن بۆ ئەوەی منداڵ لە گەڵ شوێنەواری قوتابخانەدا بگونجێت، وا باشە ئەو منداڵانەی كە لە باخچەی ساوایان دا لە یەك پۆل دابوون بنە هەمان پۆلی یەكەمی قوتابخانەی سەرەتایی، ئەگەر ئەمەش گران بوو، هەندێكیان بچنە هەمان پۆل تاكو منداڵەكە هەست بە تەنیایی نەكات و شەرم دای نەگرێت، ئەگەر منداڵێك شەرمن بێت واباشە ماموٚستای دیدەنی ماڵەوەیان بكات و خۆی پێ بناسێت، یان باوك بۆ ماوەیێك لە گەڵی لە ناو پۆل دا دابنیشێت هەتاكو لە گەڵ شوێنەواری قوتابخانەدا بهۆگرێت و هانیش بدرێت پەیوەندی كۆمەڵایەتی لە گەڵ قوتابیەكانی پۆل دا ببەستێت، هەروەها پێویستە مەرجەكانی تەندروستی وەكو هەوای پاك و سازگارو هۆدەی ڕێكوپێك و ڕووناكی و خاوێن بۆ قوتابخانە ساز بكرێن وكەل و پەل و هۆیەكانی فێربوون و ئەندازەی یاریی قوتابخانە هاوچووی باخچە ساوایی یەكان بن، هەروەكو ((سۆزان ئابزكس)) دەڵێت : ((پێویستە شێوەی دامەزراندنی قوتابخانەو سازكردنی كەل و پەلی فێربوون و یاری لە گەڵ چالاكی و جوجۆڵی منداڵان دا بلوێن.))

(٥) دەبێ لە ژێ یە نایەبەكانی قوتابی بدرێت و بەهرەكانی سەر هەڵ بدەن، خۆ ئەگەر لەوانەی بیردۆزی دا كەم توانا بێت با هان بدرێت بەهرەی لە بواری تردا دیار بكەوێت، قوتابی‌یەك لە وانەیێك دا بەهرەی نەبوو مانای ئەوە نی‌یە ژێربكەوێت و فڕێ بدرێتە سەر شەقام، بۆیە دەبێ بایەخ بە هەموو وانەكانی بدرێت و بواری پسپۆری هەر لە كاتێكی زووەوە بكرێتەوە، مەبەستی گەورەی قوتابخانە پێ گەیاندنی وەچێكی كاریگەر بێت، وانەش بۆ سوود نەك بۆ تاقیمانەو فێرنامە بێت و فێری بكات چۆن ژیان بكاتە قوتابخانەیێكی هەمیشەیی‌و لە خوازتنی زانیاری دا قەت سڵ نەكات .

## ((بەندی حەوتەم))

## ((هەرەتی هەرزەکاری))

وشەی هەرزەکاری ((Adolescence)) لە کرداری لاتینی ((Adolescere)) وەرگیراوە کە پلە بوون بۆ پێ گەیوی لەش و رەگەزو هۆش و دەروون دەگەێنێت. کەچی وشەی باڵق بوون ((puberty)) پێ گەیاندنی گلاندەی زاوزێ وەبەدیار کەوتنی رووالەتی رەگەزیی نوێ دەگەێنێت، ئەمەش بە سێ ماوەدا تێ دەپەڕێت:-

أ- پێش باڵق بوون: ئەم ماوەیە مژدەی گەشەکردنی رەکەزی دێنێت.

ب- تاوی باڵق بوون: لەم ماوەیەدا گۆڕانە رەگەزی یەکان بەدیار دەکەون و گلاندەی رەگەزی دەست بە فەرمانەکانی دەکاتەوە، بەڵام هێشتا نەگەیشتۆتە رادەی گەیوی.

ج- تاوی پاش باڵق بوون:- لەم ماوەیەدا کۆئەندامی زاوزێ بە تەواوی بە فەرمانەکانی هەڵ دەستێت، ئەمەش لە یاد نەکەین دەست پێ کردن و کۆتایی هاتنی ئەم ماوانە بە هۆی جیا جیاوە کە بە نەژادو شوێنەوارو بایۆلۆژیی منداڵەکە پەیوەستن، لێ کۆڵینەوەکانی ((کیوبتشك)) سەلمادوویانە کە لە ((٥٠٪))ی کچانێ نێوان ((١٢،٥ ١٥،٥)) ساڵی لە لایەن رەگەزەوە پێ دەگەن، کەچی کوڕان لە نێوان ((١٤ ١٥،٥)) ساڵی دا پێ دەگەن. یەکەم شەقڵی گەیوی رەگەز لای کچ بێ نوێژی یە کە بە تێکرایی لە تەمەنی ((١٣،٥)) ساڵی دا بەدیار دەکەوێت، کەوتنی یەکەم دڵۆپەی خۆین پێی دەوترێت ((First menstution)) پاشان بۆ ماوەیێك خوێنەکە دەبڕێت، عازەب لەم ماوەیەدا بۆ پیتێن ئامادە نی یە. عازەب کە بۆ یەکەمجار بێ نوێژی دەبینێت دووچاری چەند ئازارو دڵتەنگی و ماندوێق و سەر ئێشەو رشانەوەو ورووژاو دەبێت ((کۆنکلین)) لێ کۆڵینەوەێکی بەسەر ((٤٧٥)) عازەب دا کرد دیتی: لە ((٥١٪))یان واقیان لەم رووالەتەدا ورما، لە ((٢٤٪))یان گرنگیان پێ نەدا و لە ((١٥٪))یان غەم تارمایی بە سەریان دا گرت، لە ((٧٪))یان لێی بێزار بوون، ولە ((٦٪))یان شانازییان پێ برد. هەندێ کچ کە بێ نوێژی دەبینن تووشی ئاخوولان و ماخوولان دەبن بەتایبەتی ئەگەر هەست بە خۆشەویستی دایك وباوکیان نەکردبێت، ئەمانە هەست دەکەن کە ئەندامێکن لە ناو کۆمەڵەی مێ ینەدا و شوێنەوارنیش بە تەمبەڵی وکەمی لە قەڵەمیان داوە، هەر بۆیە ئەم رووالەتە بە بەندایەتی و لاوازی و لەعنەتی دادەنێن و بەئازار کێشانەوە دەی بەستن و بەشەرم وترسەوە تەماشای دەکەن بەردەێك ناتوانن ناوی بهێنن. ((هافلۆك ئەلیس)) دەڵێت: ((کچێك خۆی کوشت، چونکە وای زانی کەتووشی نەخۆشی یەکی کوشندە بووە، کە تەرمەکەیان خستە ژێر تێ روانینەوە، دیتیان ئەم نەخۆشی یە تەنیا بێ نوێژی بووە)). کچی واش هەیە ئەم رووالەتە بەسزاێکی ئاسمانی لە قەڵەم دەدات و خۆینەکەش مایەی چڵکنی دەنوێنێت و لەگیانی خاوێنی دووری دەخاتەوە. ((هیلین دوێتیش)) دەڵێت: ((لە ئەنجامی ترس

وبێزار بوونی کچی هەرزەکار لە ڕووالەتی بێ نوێژی دا دەشی خوێنەکــە لەشــوێنە سرووشــتی یەکە ببڕێت ولـە شوێنی تردا هەر وەکو کونە لووت دەرپەڕێت ئەم ڕووالەتەش پێ دەوترێت بــێ نوێــژی جێگــرەوە ((Vicarious menstuation)). دەشــێ تــرس و هەســت کــردن بەکەمایەتی ببنە مایەی سەپاندنی ئەفسانەو نەدیوی وئەندێشەی دوور لە ڕیالیستی بەسەر کچی هەرزەکاردا وتووشی غەم وپەژارە بێت وخۆی گۆشە گیر بکــات و لــە شــووکردن ونــەژادی نێرینە بترسێت و دووچاری ئاڵۆزی لەش بەددی بێت، بۆیە دەبێ دەربارەی گۆڕانەکانی هەرەتی هەرزەکاری بزانێت وشتێکیش دەربارەی ڕەگــەز بزانێــت. بــە پــێ ســەر ژماردنــەکانی ((ولیــم هیمر)) دەشێ هەرزەکار تووشی خوێن کــەمی وخــواری بــر بــرەی پشــت و پڕانــی کونــەلوت وسەرئێشە وشێواویی کوتانی دڵ ونەخۆشی یە دەماری یەکان بێت.
هەرزەکار لە ساڵی یەکەمی هەرەتی هەرزەکاری دا هەست بە هێزێکی شاردراو دەکـات ودەی بزوێنێت یەکەمجار ئەم هێزە بە شێوەیێکی ڕووپۆش دەردەبڕێت هەر وەکو دڵسۆزی بۆ یــەکێکی گەورەتر لـە خۆی بنوێنێت ئەنجا چ هاونەژادی خۆی یان پێچەوانەی بێت، زۆر هــەرزەکار هــەن شەیدای مامۆستای خۆیان دەبن بەتایبەتی ئەگەر مامۆستاکە جێ ڕەزامــەندی یـان·بوو بێــت وبــە دڵیان چوو بێت، پاشان ئەم شەیدای یە بۆ نەژادی تر ئاڵو گوێز دەبێت، هەر وەکو کوڕ شــیدای کچی دراوسێ یان خزمی خۆیان ناسیاری خێزان یان ئەستێرەیێکی مەیدانی هونەر بێــت، دەشــێ کچەکە لـە خۆی گەورەتربێت، ئەوساکە بەدوای دەنگوباسی دەگــەڕێت، یـان وێنەکــەی هــەڵ دەگرێت یان لـە دیواری دەدات، بۆیە پێویســتە تــەلی هەســتی ناســکی بــە تــیرو توانــج زامــدار نەکەین، نەوەکو دووچاری ئاڵۆزیی ڕەگەزی بێــت و ژیــانی تــاڵ بکــات، کچــی هــەرزەکاریش شەیدای کچی هاوتەمەنی خۆی دەبێت، دەشتی شەیدای زیاتر لـە کچێك بێت، ئەم دیاردەیە پێی دەوترێت تامەزرۆی هەرزەکاران ((Boy and Girl Crazy petiod)) ئەم یاردەیە لــە کچــی هەرزەکار لــە نێــوان (١٤-١٥) ســاڵی دا ڕوودەدات، کــەچی لــە کــوڕ نێــوان کــوڕو کــچ پەیوەندیێکی پاك و ڕۆمانتیکی یە (Romantice Love). نــوژدار ((ســپوك)) دەڵێــت: ((ئــەم هەستە ڕۆمانتیکی یە بۆ ماوەی شەش ساڵ لە ناو نەســتی هــەرزەکاردا کــپ دەکرێــت وکــوڕی هەرزەکار پــەیرەوی خوێنــدن وئەرکــەکانی ماڵــەوە وقوتابخانــە دەکــات وزۆریــش بــە مامەڵــە نەرمەکەی دایکی ڕازی نی یە وحەز ناکات وەکو منداڵی ساوا بی خاتە باوەشی وماچی بکات، کەچی کچی هەرزەکار وەکو کوڕ ئەم هەستەی بــە قووڵــی کــپ ناکــات وهاوچــاوی دایکــی دەکات وپەیرەوی دیمەن وجوانی دەکات)).
گەشە کردنی لەشی هەرزەکار:- پەرە سەندنی گەشە کردنی لەشی هەرزەکار بە ساڵێك پێــش باڵق بوون دەست پێ دەکات، لای کوڕ لە نێوان (١٢ ١٥) ســاڵی دا دەســت پــێ دەکــات وتاکو (٢٠ ٢١) ساڵی درێژە دەکێشێت، لای کچ لە نێوان (١٠ ١٤) ســاڵی تەمــەنی دا

دەست پێ دەکات وتاکو ((١٨)) ساڵی تەمەنی بەردەوام دەبێتەوە. لێ پرسراوی ئەم گەشەکردنە هۆرمۆنەکانی ناوەوەن ((Growth hormones)) کە گلاندەی ژێر مێشك دەریان دەدات. بەپێ لێ کۆڵینەوەیێکی ئەمریکی کە لەساڵی ١٩٤٣ بەسەر منداڵان دا کراوە بەدیار کەوت: بەژنی کور وکچ لە تەمەنی (١١) ساڵی یان دا یەکسانە ولە تەمەنی (١٣) ساڵی یان دا کچ ی گرێ درێژترە لە کور ولە تەمەنی (١٥) ساڵی یان دا درێژی یان یەکسان دەبێتەوە ولە تەمەنی (١٨) ساڵی یان دا کور (٢،٥ ٣) گرێ لە کچ درێژترە بەپێ لێ کۆڵینەوەی ((شتلۆرث)) کە لەساڵی ١٩٣٨ بەسەر منداڵان دا کراوە بەدیار کەوت: کێشی کوران لە نێوان ((١٤ ١٦)) ساڵی تەمەنیان دا زائد وکێشی کچان لە نێوان ((١٢ ١٤)) ساڵی تەمەنیان دا لە پەرەسەندن دایە، ئەمەش سەبارەت بەوەیە کچ زووتر باڵق دەبێت وهەندێ گلاندەی لە دەردان دا چالاك دەبن. لە نیشانەکانی گەشە کردنی لەشی هەرزەکار باڵا درێژی وزیاد بوونی کێشی لەش ونێوشان پانی ودەست خڕهەڵ گەڕانە

لە زۆربەی بارو دۆخ دا گۆڕانەکانی لەشی هەرزەکار بوی مایەی نەسرەوتی یە ئا ئەوەتا سەری بەشێ ولە ژێر پشێوی دلی دا دەناڵێت، چونکە دڵ تەنیا لە ٣٠٪ ی قەوارەی گەشە دەکات کەچی پێویستە لە ٢٠٠٪ لەرادەی دەرپەڕاندنی خوێن بۆ لەش زیاد بکات، ئەمەش بارێکی سەخت وگرانە، هەر بۆیە ئارەزووی یاری ناکات وتەمبەڵە ولەشی خاوە وبزووتنەوەکانی نارێك و وورد نی یە، ئەم قۆناغەش پێی دەوترێت:

((The Awkword Age)) ، هەر بۆیە بەرگری لەدژی نەخۆشیەکان لاواز دەبێت ودەشێ تووشی نەخۆشی هەمە جۆرە بێت هەر وەکو نەخۆشی کەم خوێنی وسیل بەتابەتی ئەگەر لەچینی هەژاران بێت. کچی هەرزەکاریش ناو بەناو دووچاری زگ یەشە دەبێت وپەست وتووڕەشە.

زۆر لە هەرزەکاران سەیریان بە دەنگی خۆیان دێت، دەی بیسن جارێك نەرمە وجارێکی تریش گڕە چونکە ڕشتەی بێژاندنیان کتوپڕ گەشە دەکات، ئەم گۆڕانەش لە زۆربەی بارو دۆخ دا دەبێتە مایەی شەرمیان بەتایبەتی لەپێش میوانان دا، دەنگی کچیش قەبە دەبێت. لووتی هەرزەکار دەگاتە ئەو پەڕی گەشەکردنی وهەرواش دەزانێت کەتێك بچڕاوە ولە گەڵ ڕوومەتی دا نالوێت وئەنجا دەشێوێت وچەند جارێك تەماشای ئاوێنە دەکات وهەروا دەزانێت کەدیمەنی نارێکە، ئەم بارەش بە گەشەکردنی گشت ئەندامانی ڕوومەتی لادەچێت . لە گیروگرفتەکانی هەرزەکار گۆڕانەکانی سەرپێستی یەتی، چونکە توێی سەرپێت فراوان دەبێتەوە و ڕۆنێکی زۆر فرێ دەدات و ڕۆنەکە تێ کەڵ بە تۆز دەبێت و توێیەکان زیاتر فراوان دەبنەوە و ڕێ بۆ خۆرەکان خۆش دەکەن و دەبنە مایەی هەوکردنی پێست یان دووچاری زیپکەی دەکەن، ئەنجا هەرزەکار هەست بەشەرم دەکات و بەم دیمەنە نارێکە نەسرەوت دەبێت، کەهەرزەکار زیپکەکە دەخورێنێت و دەیگووشێت هەتاکو دەی فلیقێنتەوە، خۆرەکەش بەهۆی دەستی یەوە بۆ شوێنی

تری ڕوومەتی بڵاودەبێتەوە و بەم جۆرە هەموو ڕوومەتی بەزیپکە دادەپۆشرێت، بۆ ئەوەی هەرزەکار چارەی ئەم ڕووالەتە بکات پێویستە لە سەری : ١- لە ناو هەوای بەرڵلاو لە ژێر تیشکی خۆر دا وەرزش بکات. ٢- چەوریو شیرینی زۆر نەخوات. ٣- بەهێواشی ڕوومەتی بە پارچەیێك قوماشی خوری و هەندێ سابوون کە ماددەی ((هێکساکلۆرۆفین)) ی تێ دا بێت بشوات، پاشان بە ئاوی گەرم و دوایی بەئاوی ساردی بشوات. ٤- دەبێ دەستی لە ڕوومەتی نەدات و زیپکەکان نەخورێنێت و نەگووشێت و ئەگەر خۆی نەگرت با پارچە لۆکەیێکی شێدار بۆ گووشین و هەڵکەندنیان بەکار بێنێت . هەروەها گلاندەی ئارەقەی هەرزەکار زۆر کارمەندە بە ڕادەیێك بێزاری دەکات بە تایبەتی ئەگەر ماندوو بوو بێت یان هەستی خرۆشا بێت،ئارەقەیەکی زۆر لە دەست و ڕوومەتیەوە دێتە خوارێ و ئارەقەیێکی بۆن ناخۆشیش لە بن هەنگلیێ فڕێ دەدرێت، ئەم بۆنەش بێزاری دەکات، بۆیە دەبێ هەموو ڕۆژێك بن هەنگلیێ بشوات وماددەیێکیش بۆ لە ناو چوونی بۆنەکە بەکار بێنێت. هەروەها کوتانی دڵی هەرزەکار بەتێکرایی ((٨)) کوتە لە خولەکێك دا کەم دەبنەوە، ئەم کارەش مایەی شێواندنی پاڵە پەستووی خوێن وکەم بوونی ڕادەی چوونی ئۆکسجین بۆ هەموو ئەندامەکانی لەشی ئەنجام دەدات، ئەم گۆڕانەش دەبێتە مایەی هەست کردنی هەرزەکار بە ماندوویێتی وخاوی ماسوولکەکانی وکەم بوونی توانای لە ئیش کران دا باوکی ئەفامیش هەروا دەزانێت کورەکەی چەپەڵ وتەمبەڵە وقۆشمەی پێ دەکات وهەستی دەورووژێنێت. هەروەها گەدەی هەرزەکار زۆر کارمەندە ومگێزی بۆ جواردن لە گەشەدایە هەتاکو ئەم دیاردەیە بەشێوەی هەرلووشی لێ بەدیار دەکەوێت بە مەرجێ دووچاری گرفتە دەروون نەهاتبێت، بۆیە دەبێ بۆ نەرێنی لێ هاتووی سەرخوان ئاڕاستە بکرێت بەبێ ئەوەی هەستی زام بکرێت.

گەشەکردنی هۆشی هەرزەکار:- گەشەکردنی هۆشی مەردوم لەهەموو تەمەنێك دا بەهەمان خێرایی ناڕوات، بەبێ لێ کۆڵینەوە بەدیار کەوتووە: ئەم گەشە کردنە لە بچووکی یەوە هێدی بە، لەمیانی قۆناغی (دوا دوایی منداڵێتی) تاکو (قۆناغی سەرهەڵدانیهەرزەکاری) خێرایە، لە دوای تەمەنی (١٦ ) ساڵی دووبارە دەست بە هێدی بوون دەکاتەوە. ئەم گەشەکردنە کار دەکاتە سەر شارەزایی وتوانای تایبەتی هۆشی یەوە هەروەکو بە بیرهاتنەوەو چەسپاندنی مێشك و وریا بوونەوەو بەڵگەهێنان وئەندێشە. هەر بۆیە هەرزەکاردەتوانێت زۆرترین ژیندداری دێران بکاتەوە ،بەڵام دەیەوێت تێ بگات نەك هەروەکو ئامێرێك لەبەر بکات، لەڕاستی دا هەرزەکار لەتەمەنی (١٥) ساڵی دا زۆر بایەخ بەبابەتی بەرهەست وتەنکاو وسادە نادات بەڵکو دەکەوێتە ویزەی بابەتی واتادار وقووڵ دەیەوێت بابەتەکە هەڵ بسەنگێنێت پاشان شیتەڵێ بکات،تاکو نەگاتە ڕادەی سەلماندن دان بەڕاستی یەکەی نانێت، هەرزەکار حەز دەکات بۆ هەر تەلەسمێك کلیلێك بدۆزێتەوە وبۆ هەر چەمکێك بەڵگە بهێنێت ولە هۆیەکانی ڕووالەتێك بتۆژێتەوە، بۆیە

پرسیاری زۆر دەکات وحەز بە گفتوگۆ ودەمەتەقێ دەکات، پێویستە لەسەر مامۆستا چاك وانەکەی دێران بکات وبە بەڵگەی زانستی قوتابی یە هەرزەکارانی بهێنێتە ڕادەی سەلماندن وتێ گەیشتن، چونکە هەرزەکار بەئاسانی ناگاتە ڕادەی سەلماندن وتێ گەیشتن، دەشێ پەست بێت وبایەخ بە وانەکەی نەدات ویاخی بێت ئەگەر مامۆستای ئەم ئارەزووەی تێر نەکات. کەچی منداڵ زوو دەسەلمێنێت وکەمیش ڕەخنە لە مامۆستای دەگرێت، خۆ ئەگەر مامۆستا بێ باك وبێ ویژدان وکەم ڕۆشنبیر بێت دەشێ زۆر شتی بە هەڵە فێر بکات، ئەم هەڵانەش زۆر بە گرانی ڕاست دەبنەوە. ((ارثر جیتس)) دەڵێت: ((هەرچەند منداڵ بە تەمەن بچووك بێت زیاتر بیری دەچەسپێنێتە سەر ڕووداوی ڕیالیستی وەها کەبە شارەزایی وکاروباری خۆی یەوە پێوەندیان هەبێت، بەلام کەتەمەنی گەورە بوو، ئەو ساکە خۆی خەریکی کاروباری دوورو نەڕاستە وخۆ دەکاتەوە ودەیەوێت چارەسازی کاروباری واتادار بکات، ئەمەش لە هەڕەتی هەرزەکاری دا بەدیار دەکەوێت، چونکە هەرزەکار پەیڕەوی ژیانی کۆمەلایەتی دەکات ولە توانای دا هەیە ڕووداوی ئێستاکە بە ڕووداوی دێرین وداهاتوو ببەستێت ولەگەڵ یەکتری دا بەراوورد بکات وسوودیان لێ وەربگرێت.)). گیروگرفتەکانی هەرزەکار وای لێ دەکەن کە بتوانێت گیروگرفتی ئاڵۆزاو شیتەڵ بکاتەوە وبەبێ وەڕس بوون مێشکی بخاتە سەر بابەتی گران ولێ کۆڵینەوەی زانستی. هەرزەکار بیر لەشوێنەواری خۆی دەکاتەوەو لە ڕژێمی گەردوون ونهێنی سرووشت وگرنگی ژیان دەتۆژێتەوە، هەر چەندەکی شوێنەوارەکە فراوان بێت زیاتر هەست بەقووڵی دەکات وبەشی کردنەوەی گرێ وتەڵەسمەکانی یەوە خەریك دەبێت وبیر لەتەگەرەکانی ژیان وگیروگرفتی کۆمەلایەتی وچارەسازیان دەکاتەوەو شێوازی شی کردنەوەی ئەم گیروگرفتانە ڕادەی زیرەگی دەر دەخات. نوژدار ((فؤاد ابهي)) دەڵێت: ((پێ زانینی مەردوم هەر لە منداڵی یەوە بۆ هەڕەتی هەرزەکاری وتاکو ژیانی داهاتووی هەر بەردوامە، تاقی کردنەوەکانی ژیان فراوانی دەکەنەوە وبە لێ کۆڵینەوەی زانستی وهەوڵ وکۆششەوە گەشە دەکاتەوە وپوخت دەبێتەوەو دەگاتە دانانی ڕێبازێك بۆ ژیانی)) ئەنجا دەبێ هان بدرێت خۆی خەریکی شتی بەکەڵك بکات نەوەك بەرنیگاری شتی پڕوو پووچ بێت لەوەی شایانی باسە ئەندێشەی هەرزەکار زۆر بەپیت وفراوانە وبە پەخشانی جوان ونایاب کە ناوەڕۆکی پڕە لە هەستی مرۆڤایەتی وخۆشەویستی وخۆبەخت کردن دەردەبڕێت، هەستی کچی هەرزەکریش ناسك و ووردەو بە پەخشانو هەڵبەستی نایاب دەردەبڕێت، دوکتور ((عبد المنعم المليجي)) لە پەرتووکەکەی ((النمو النفسي)) دا پەخشانی هەرزەکارێکی نووسیوە کەباسی بەهەشت دەکات: ((بەهەشت باخچەیێکی دڵڕفێنە، فریشتەکان پاسەوانی دەرگاکانینە زەوی یەکەی بەچەو داپۆشراوە ولە ناوەڕاستی دا ڕووبار دەڕۆن ولەسەر ڕۆخەکانیان دا داری میوە ڕوواوە، ئەمە سێوە، ئەوی تر ترێ یە، یەکێکی تر دارخورمایە هەنارە، دار زەیتوونیش باڵی سێبەری

به سەریان دا کشانووەو هەموو بەگوڵ وگوڵزار ڕازاوەتەوە وبۆ یـەکتری بـزەی لێویانـە، دیمەنـەکانی چاو دەگەشێنن ودڵ بەند دەکەن، بۆ شیتی ئەوەندە ڕەنگینە، چاوم شتی وای نەدیوە)). هـەروەها توانـا تایبەتی یەکانی هەرزەکار بەشێوەیێکی ئاشکرا بەدیار دەکەون ولـەسەر ڕۆشنایی یان ئارەزووی بۆ هـەڵ بژاردنی پیشـەیێك بـەدیار دەکـەوێت، هـەروەکو توانـای وەرزشـی وهونـەرو بیرکـاری وزمانـەوانی وپیشەگەری ئەگەر هەر سەرکەوتنێك لە کارێك دا لـەسەر توانـای هۆشـی گشـتی وئامـادەبوونی مەردوم بۆ ئەم کارەدا ڕابوەستێت ((سپێرمان)) یـش لـەسـاڵی ١٩٠٤ دا هۆیێـەکی تـر لـەسـەر ئـەم هۆیانەی زیاد کردو ناوی لێ نا هۆی ڕەسەنی، واتـە توانـا تایبـەتی کـان. کـەچی مامۆسـتا ((محمود القباني)) دەڵێت: ((توانای گشتی هۆش وتوانای هۆش کـە پەیوەسـتە بـە بابـەتێك وتوانـای هۆشـی تایبەت بەڕاهێنانێکی دەست نیشان کراو ئەمانە هەموویان توانای هۆشی مەردوم سەر دێرانـی سـڤنێك بەدیار دەخەن)). مامۆستای ناوبراو دووبارە دەڵێت: ((توانام سەر کۆکردنـەوەی دوو ژمـارە لـەسـەر سێ هۆ ڕادەوەستێت: هۆی گشتی کەهـەموو پرۆسـێەکانی هـۆش تـێ دا بەشـداری دەکـەن، هـۆی ڕەسەنی کە پێوەستە بەهەموو کردارەکانی بیرکاری، هۆی چەشنی تایبەتی بەم کـردارە)). هـەرزەکار بەهۆی تاقیمانەی جیا جیاوە لە قوتابخانەی ئامەدەیی دا بەهرەو نایابی لـە بوارێك دا سەر هـەڵ دەدات، ئەوساکە پێویستە لـەسەر باوك ومامۆستا ڕێز لـەم بەهرەیەی بنێن وڕووکاری بـۆ پیشـە پێـك بکێشـن، چونکە گونجاوی کۆمەڵایەتـی دوارۆژی تا ڕادەیێکی زۆر بەوپیشەیە بەستراوە کـە هـەڵی بـژاردووەو تێی دا سەرکەوتووە، هەندێك باوك بۆ خۆیان پیشە بۆ منداڵیان هەڵ دەبژێرن وهەر لـە منداڵـی یـەوە لـەسەر پیشەکەی خۆیان دا ڕای دەهێنن، هەندێکی ترشیان دەیانەوێت ئـەو ئاواتـەی کـە بـۆ خۆیـان دایان نابوو بۆیان نەلوا بی گەنێ منداڵەکەیان بی گاتێ، منداڵەکەش لەپێشـەوە سـەرگەرمەو بـەئاواتی باوکی شادە بەڵام کە گەیشتە هەرەتی هەرزەکاری، ئەوساکە تێ دەگات کە هەڵ بژاردنـی ((پیشـە)) بارێکی کەسیەتی یە ولـەسەر ئارەزوو وبەهرە وڕادەی زیرەگی مروڤ ڕادەوەستێت، تەنها ئـاوات نـی یە کەدەبێ بی گاتێ. باوکی واش هەیە دەیەوێت کوڕی بە پایە وسایە بێـت وکـەس نـەتوانێت بگاتـە پایەی کوڕەکەی هەروەکو پیرە مێردی ئەمر وەتەنی: هیچ کەس نایەوێ لێـی زیـاتر بـێ هـەر بـاوك ئەڵێ: کوڕم چاتر بێ، نوژدار ((هواردلین)) ڕابەری باوك دەکات ودەڵێت: ((منداڵت مەچەوسـێنەوە تاکو ئـارەزووی خۆتـی پـێ بهێنێتـە دی)). ((ناشان بوسی)) یـش دەڵێـت: ((زۆر بایـەخ بەپیشـەی دوارۆژی منداڵت مەدە با بۆ خۆی هەڵی بژێرێت)). بەپێ لێ کۆڵینەوەی زانکۆی کالیفورنیـا بـەدیار کەوتووە: ٣/١ ی بێ کارەکان تەمەنیان لە نێوان (١٤ ١٦) سـاڵی دایـە، چونکـە لـەم تەمەنـەدا هەرزەکار لەکارەکەی دا کەم شارەزایە وزۆر لێ بێزار دەبێت وبەجێ دەهێلێت، بۆیە دەبـێ دەرفـەتی بدەینێ تا دەگاتە ساڵە دوایی یەکانی هەرەتی هەرزەکاری بۆ ئـەوەی پیشـەیێك بـە ئـارەزووی خـۆی هەڵ بژێرێت. ئەوەی شایانی باسە گەشەکردنی هۆشی مەردوم تـاکو تەمـەنی (٢٥) سـاڵان هـەر بەردەوامە، بەڵام وا بەدیار کەوتووە هەرچەندەکی مێشکی ئادەمیزاد بە لێ کۆڵینـەوەی زانسـتی

یەوە خەریك بێت ئەوەندەش زیـاتر خوێـنی بـۆ دەچێـت ودەمارەكانیشـی زیـاتر فـراوان دەبـن وئەمەش دەبێتە مایەی زیاد بوونی ڕادەی زیرەگی ودێران كردنی بابـەتی زانسـتی زۆر. بـەپێ لێ كۆڵینەوەی ((ترمان)) منداڵ لە نێوان (١٢ ١٣) سـاڵی داوە بـۆ تـام لێ وەرگرتـن وەكتێـب دەخوێنێتەوە هەروەكو چیرۆكی پاڵەوانانی مێژوو وژینامەی پیاوە ناودارەكـان، لەتەمـەنی (١٤) ساڵی دا بەپێ خواست ونـارەزووی خـۆی كتێـب دەخوێنێتـەوە ولـە تەمـەنی (١٥) سـاڵی دا چیرۆكی داهێنان وگەڕۆك وگەشت وكتێی هونەری دەخوێنێتەوە ولـە تەمـەنی (١٦) سـاڵی دا عەوداڵی ژیانداریی گشتی دەبێت وڕووداوی تازە دەخوێنێتەوەو وێڵی دەنگوباسی وەرزشە.
گەشـەكردنی دەروونـی هـەرزەكار:-لەبـەر ئەمـە هـەرزەكار بـەرەنگاریی گۆڕانێكـی لەشـی وفسیۆلۆژی دەبێت، ئەم گۆڕانەش تارادەیێكی زۆر كار دەكاتە سەر دەروونی، لەوە دەترسـێت نارێكی یەك لە لەشی دا هەبێت، هەر بۆیـە زوو دەخرۆشـێت وبەرەخنـەیێكی سـادەش هەسـتی دەزمێت، هەروەها گۆڕانەرەگەزی یەكان بەتایبەتی ئەگەر پێ یان نەزانێت وڕابەر نەكرابێت لـە زۆربەی بارودۆخ دا پێ یان دەشێوێت ونەسرەوت دەبێت، لێ كۆڵینەوەێك لە ئەمریكا بەدیاری خستووە كە هەست كردنی هەرزەكار بەرەكەزیی لە وەرزی هاوین دا بەڕادەی لـە ٤٠٪ زیاترە لە چاو وەرزی زستان ولە ٧٥٪ ی هەرزەكاران سەبارەت بەم هەستەیان دووچـاری مـاندوێتی دەبن وتەنها لە ٢٥٪ یان هەست بەخۆشی دەكەن، بۆیە دەبێ ڕێز لـە سـیفەتەكانی هـەرزەكار بگیرێت وشانازی یان پێوە بگرێت وبەدڵ ودەروونێكی خۆشبینی پێشوازی ئەم هەرەتـە بكرێـت، لە زۆربەی كۆمەڵە سەرەتاییەكان دا كە منداڵ دەگاتـە هـەرەتی هـەرزەكاری شـیلانێكی بـۆ دەگێڕن و هێزی منداڵەكە تاقی دەكەنەوە ئایا لە كەڵەمێردی دەچێت یان نەء؟ وانـەی تایبـەت بە ڕەوشت پاكی بە كچی هەرزەكار دەوترێـت، ئەوسـاكە هـەرزەكار هەسـت بـە پـای خـۆی دەكات و شانازی بە خۆیەوە دەبات، باوكێك بە كچەكەی دەوت : ((ئەمیرەكـەم)) ئـەم وشـە نایابە هانی كچەكەی دا- بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو چاپلووسـی یـەكی چلكـن دا، كـەچی تەریق كردنەوەی هەرزەكار و تیروتوانج تێ گرتنی دەبنە هۆی هەست كردنـی بـە كەمایـەتی و گرێـی زانـد دەروون و تـاڵ و ڕەش بوونـی ژیـانی . مامۆسـتا ((لیـزا كـیر كندال)) دەڵێـت : ((منداڵێك لە لای دایك و باوكی خۆشەویست بێت و لە ماڵەوە هەست بە خامۆشـی بكـات، ئەم مامەڵیە یاریدەی پەروەردەی ڕەگەزیی دەدات و مەبەستی خاوێن و ئابڕوودار دەكەونـە نـاو دڵیـەوە و هـەردەمیش دەبێتـە جێـی ڕەزامـەندی .)). ((مـارگریت میـد)) لێكۆڵینـــەوەێكی دەربارەی ((٥٠)) كچی هەرزەكاری سێ گوندی دوورگەی ((ساموا)) كرد كە دەكەوێتـە ١٣ پلە باشوری هێڵی ئیستوا، لێ كۆڵینەوەكـە ((٩)) مـانگی خایـاند ((میـد)) لـە گـەڵیان ژیـا و شارەزای ڕێبازی پەروەردەیان بوو بۆی دەركەوت ڕێبازی پـەروەردەی منـداڵ هـەر لـە سـاڵی یەكەمی تەمەنەوە كەسیەتیی منـداڵ دەخولقێنێـت، هـەروەها ((میـد)) لێ كۆڵینـەوەێكی تـری

بەسەر سێ بەرە باب دا کرد، ئەوانیش ((ارابیش)) و ((منداجور)) و ((چمبولی)) بوون. دیتی: هەرزەکار لە کۆمەڵی ((ارابیش))دا هێمنە سەبارەت بەوە دایك (٣ ـ ٤) ساڵ شیری دەداتێ و باوکیش ئاوڕ لە منداڵەکەی دەداتەوە منداڵەکە هەست بە دڵنیایی دەکات. کەچی هەرزەکاری ((منداجور)) شەڕانییە سەبارەت بەوە دایك منداڵەکەی دەخاتە ناو سەبەتەیێکی ڕەق و دەمەو و ڕوو درێژی دەکات و فەرامۆشی دەکات، کە گریا بە توندی لە سەبەتەکە دەدات، ئەگەر لە گریان نەکەوت بە پەلە و بێ لاواندنەوە و سەر پێیانە شیری دەداتێ و ناهێڵێت تێر بخوات و بەتوندی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، کەچی هەرزەکاری بەرە بابی ((چمبولی)) دەرکە نارە چونکە دەسەلاتی ئافرەت بە سەر خێزان دا سەپاوە و زۆر بە توندی مامەڵەی منداڵەکانی دەکات، منداڵ کە گەیشتە تەمەنی شەش ساڵی بە تەنیا لەماڵەوە بەجێ دەمێنێت وە وکەس نابینێت و دەتدسێت و نەسرەوت دەبێت . دکتۆر ((مصطفى فهمي)) لێ کۆلینەوەیێك دەربارەی منداڵەکانی تیرەی ((شیلۆك))ی خوارووی ((سودان)) ی کرد، دیێ: منداڵ لەساڵی یەکەمی تەمەنی یەوە هەست بە دڵنیایی وکامەرانی دەکات، دایك تا تەمەنی (٣ ـ ٤) ساڵی هەر شیری ئەداتێ ولەتەنیشتی یەوە دەخەوێت وخوشکەکانیشی خزمەتی دەکەن، کە دایك لە کارەکەی هاتەوە خواردنی دەرخوارد دەدات وبە ڕوو پێ کەنینەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات ویاری لەگەڵ دەکات وخۆشی دەوێت، بۆیە بەرەنگاریی هیچ گرفتێکی دەروونی نابێت، کەتەمەنی گەیشتە شەش ساڵان دایك وباوك لەسەر کار ڕای دەهێنن ولە ژێر چاوە دێریان وبۆ خۆی فێری کارکردن دەبێت وکەگەیشتە هەرەتی هەرزەکاری ئاهەنگی سەمای بۆ ساز دەکرێت وبۆ شان دان بەر ژیان ئامادە دەبێت وزوو ژن دەهێنێت وخێزان پێکەوە دەنێت ئەم ڕووکارانەش دەبنە مایەی هێمنی دەروونی هەرزەکار، بەپێی لێ کۆڵینەوەی دکتۆر ((صموئیل مفاریۆس)) دەربارەی کۆمەڵێ میسری کردوویەتی بۆی ئاشکرابوو: هەرەتی هەرزەکاری باری لادان وباری گۆشەگیری وباری دەست درێژکردن وباری هێمنی تێ دایە، ئەوەی زیاتر بۆی ئاشکرابوو هەرزەکاری هێمن بووکە لەماڵەوە هەستی بە دڵنیایی دەکردو ڕێز لە هەستی دەنرا وباوەڕ لە نێوان ئەندامانی خێزان دا هەبوو وبەشداری چالاکی یەکانی ماڵ و خێزانی وقوتابخانە وکۆمەڵی دەکرد ولە قەتابخانەدا سەرکەوتوو بوو وئاستی ئابووری باش بوو، کەمو کووڕی لە لەشی دا نەبوو، دەرفەتی درابوو بۆ لێ پرسیاریی وسەربەستیی زامن کرابوو، ئەم هەرزەکارە هاوسەنگ بوو، هەست بە ڕەزامەندی دەکرد ودەگونجا وئەندێشەی پڕوو پووچ وبەدگومانی کەم بوو. سەبارەت بەگۆڕانەکانی لەشیش هەرەتی هەرزەکاری بەو ڕوو ژاوی توند ناسراوە، دەبینێت هەرزەکار لە سادە ترین هۆ شۆڕش هەڵ دەگیرسێنێت، خۆ ئەگەر هەستی ناسکی زما پەست دەبێت و ناتوانێت خۆی هاوسەنگ بکات، ئەنجا هاوار دەکات، ئاژاوە دەنێتەوە، هەندێ جاریش شادە و کەیف خۆشە و هەڵسوکەوتی سەیری لێ بەدی دەکرێت و بزووتنەوەکانیشی

هاوسەنگ و ڕێك نین، هەروەکو فیکە لێ بدات، گۆرانی بلێت و بە دەنگی بەرز بخوێنێتەوە، جاری واش هەیە باڵی شووم و بێزاری و ڕەشبینی تارمایی بە سەردا دەکێشێت و دەشێ دووچاری کۆڵ دان و سڵ کردن و غەم و ئازاری دەروونی بێت، دەروونناسان بەم دەروونە دەڵێن خەمۆکی ((Frust ration)) هەرنەکار لەم بارە دەروونەدا هەروا دەزانێت داب و نەریتی کۆمەڵ تەگەرە دەخاتە بەر ئاواتی و ناتوانێت بەر هەڵستی ئەم تەگەرەیە بکات، هەر بۆیە یەکێك لە دەروونناسان دەڵێت: ((دەبینیت هەرزەکار لە ژیانیدا دەمێك بێزار و پەست و غەمگینە و خۆی تاوانبار دەکات و مردن بۆ خۆی دەخوازێت، دەمێکی تریش لە ژیانیدا ڕازییە و بە ژیانی شادە و شانازی بە خۆی دەبات.)). بۆیە پێویستە لە سەر پەروەرد کاران بیر لە دەروونی بکەن و ڕێز لە بیر و ڕای بنێن و ئامانجیان چارە سەر نەك سزادان، هان دان نەك تەریق کردنەوە بێت. ((ڕۆسۆ)) دەڵێت: ((چاوە دێری هەرزەکار بکە بە بێ ئەوەی هەستت پێ بکات، هەڵەکانی ڕاست بکەوە بە بێ ئەوەی پێت بزانێت، ئامۆژگاری بکە بە بێ ئەوەی لە پایەی نزم بکەیتەوە.)). ئەمەش لە یاد نەکەین هیچ وەختێك بە توند و تیژی هەڵەکانی هەرزەکار ڕاست نابنەوە بەڵکو زیاتر مەیدان دەخوازێت و سەر کەشی لە ماڵ و قوتابخانە دەکات، ((بۆلدوین)) دەڵێت: ((هەرزەکارێك لە ژێر دەسەڵاتی باوکی بناڵێت، گونجاوی کەمە و ناتوانێت خۆی لە ناو کۆمەڵدا بچەسپێنێت.)). کە چی ((رنیهارد)) و ((فولر)) دەڵێن: ((سزادانی هەرزەکار بە بێ تاوانێك دەبێتە هۆیێکی سەرەکی بۆ لادانی.)). هەروەها دایکی نەرم و باوکی توند لە عاستی هەرزەکاردا دەبنە مایەی ڕسکاندنی منایەتی دوو ڕوو، هەرزەکار نازانێت چ ڕاستە و چ چەوتە؟ ئەم ڕێبازەی دایك و باوکیش دەبێتە تەگەرە لە ڕێی لە گەڵ کۆمەڵدا.

بە پێی گۆڕانەکانی لەش هەرزەکار پێ گەیوە و خۆی بە پیاو دەزانێت و بەرگری لە مافەکانی دەکات، هەر بۆیە دەیەوێت سەربەست بێت و کەس خۆی لە کارو باریدا هەڵ نەقوورێنێت، دەروونناسان دەڵێن: ((ئەگەر هەرزەکار نەیەوێت لە ژێر چاوە دێری دایك و باوکیدا سەربەست بێت، ئەمە شەقڵێکی خەراپە و دەبێ نەخرێتە پشت گوێ.)). کە چی پزیشك ((عبد المنعم المليجي)) دەڵێت: ((توانای دەروونی هەرزەکار بە شێوەیێکی نەستی بۆ سەر بەستیی ئاراستە دەکات.)). هەندێ باوکیش ئەم گۆڕانە ڕەچاو ناکەن و هەروەکو منداڵ مامەڵەی لە گەڵ دەکەن و کەیفیان بەوە دێت هەر لە ژێر دەسەڵاتیان دا بمێنێتەوە، لە مەش سەیر تر ئەوەیە هەندێ باوك نەسرەوت نەوەکو کوریان لێ جیا بێتەوە و لە ژێر دەسەڵاتیان دا دەر بچێت و بێ غەمك بێت، ئەم نەسرەوتەش بە شێوەیێکی ناهەستی پاڵیان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی زیاتر بە توندی مامەڵەی لە گەڵ بکەن و زیاتریش دەسەڵاتیان بە سەریدا بسەپێنن، ئەو ساکە باوك و کوڕ دەکەونە ناو کێشەیێکی دەروونی و ڕووژاو و مانویێتی بۆ هەر دووکیان ئەنجام

دەدات، یا ئەوەتا هەرزەکار زیاتر مەیدان دەخوازێت و ڕقە بەری لـە گـەڵ بـاوك و مامۆسـتای دەکات بۆ ئەوەی خۆی بچەسپێنێت و زات دار بێت و بەر گری لە کەسیەتیی بکـات.)). یـان هەستەکانی کپ دەکات و گۆشە گیر دەبێت و باوەڕی بە خۆی وون دەکات و زیاتر بە دایك و باوکی دەپەڕ مووێت و حەز دەکات هـەر بـە منداڵـی بمێنێتـەوە و نایـەوێت لـە هیـچ کـارو فەرمانێك دا لێ پرسراو بێت و ناتوانێت بۆ خۆی بڕیار لە سەر شتێك بدات، هەتاکو هاوسـەری خۆی دایکی بۆی هەڵ دەبژێرێت و خۆی لـە کارە باریدا هـەڵ دەقوورتێنێـت و ژیـانی لێ تـاڵ دەکات. خۆ ئەگەر هەرزەکارەکە کچ بوو وشووی کرد نایەوێت لە دایەکیەوە دوور بکەوێت، دایکەش لە هەموو بچووك گەورەیێك دا لووتی دەسمێت ودەبێتە خۆرەی زیـان بەخشـی ژیـانی هاو سەرێتی. هەر بۆیە ((هاتۆیك)) دەڵێـت: ((ئـەو هـەرزەکارەی لەئـەندازە بـەدەر ئـاوڕی لێ بدرێتەوە هەڵسوکەوتی منداڵانەی لێ بەدی دەکرێت وناتوانێت شان بـەر ژیـان بـدات،چونکـە کەس نی یە نازوفیزی هەڵ بگریت.)). ئەوساکە پێویستە لەسەر هـەرزەکار تـێ بگـات کـە نـە منداڵەو نە پیاوێکی گەیوە لەلایەن هۆش وژیانی کۆمەڵایەتی ودەرامەتی یەوە بەڵکو تێ بگـات هەروەکو ((عبد المنعم المليجي)) وەتـەنی: ((بـە قۆنـاغێك دا تـێ دەپـەڕێت کـە توانـای گیـان وزیرەگی ڕێك دەخات بۆ ئەوەی بەرهەڵستی گەرداوی ژیانی داهـاتووی بکاتـەوە)). هـەروەها پێویستە لەسەر پەروەردکاران پیرۆزبایی لە سەربەسیتی هەرزەکار بکەن وهانی بدەن بـۆ خـۆی خزمەتی خۆی بکات ومتمانە بەخۆی بکات وپشت بەخۆی ببەستێت وڕێز لە بـیرو ڕای بگـرن وهانی بدەن تاکو ببێتە خاوەن بیرو باوەڕی خـۆی وبتوانێـت خـۆی لـە ناوگۆنگـەڵی ژیـان دا بچەسپێنێت وبەگری لەکەسیەتی بکات. هەرزەکار لەگەڵ ئەوەشا حەز بەسەربەستیی بیرو ڕایـە کۆمەڵایەتی وئایین وڕامیارەکانی وهەڵ بژاردنی برادەرانی دەکات زیـاتر دایـك وبـاوکی خـۆش دەوێت وڕێزیان لێ دەنێت ئەگەر تێی بگەن وڕێزی بگـرن. بۆیـە دەبـێ ڕێبـازێکی پـەروەردەیی ڕاست بگریـن کـەژیانییکی جێگـیرو هێمـن بـۆ منداڵـە هەرزەکارەکـەمان زامـن بکـات ولـە گیروگرفتی دەروونی یەوە دووری بخات نەوەکو دووچاری سەرئێشەو ڕەوشتی ناوێزەو ئـاڵۆزی دەروونی بێت، ((دروثي باروچ)) دەڵێت: ((دەبێ هەستی تێ بگەین ولە گیروگرفتی بکۆڵینـەوە وچارەی بکەین بەبێ ئەوەی زامداری بکەین یا هەستمان لە عاستی دا ئاشکرا بکەین ولەگـەڵی بژین ودەرفەتی بدەیـنێ بـۆ ئـەوەی هەسـتەکانی دەربڕێـت.)). هـەرزەکار جـارێك دەیـەوێت سـەربەست بێت، جارێکی تریش داوای یارمەتی دەکات وخۆی بە دایکی یـان بـە بـاوکی یـەوە دەبەستێت ونایەوێت لێ یان جیا ببێتەوە جارێك شلەو جـارێکی تریـش تونـدە، جـارێك هێمنـە وجارێکی تریش تووڕەیە وزو هەسـتی دەوڕووژێـت، جـارێك یـاخی دەبێـت، جـارێکی تریـش گوێڕایەڵە، بۆیە پێویستە لەسەر پەروەردکاران ئەم گۆڕانانـە بـە گەشـەکردنێکی سـادە دابنێـن وڕێز لە ئارەزووی بنێن وفەرامۆشی نەکـەن ونـەهێڵن ببێتـە جـەلادی مـاڵ کەپـەروەردکاران

خۆیان به هاورێی دابنێن ئوساكه دەتوانن به ئارەزووی خۆیان بۆ ڕەوشتی لێ هاتوو ئاراسته بكەن وبەبێ ترس گوێڕایەڵیان دەبێت وبەبێ شەرم وپلیشانەوە ڕێزیان لێ دەنێت. ((ژان ژاك رۆســۆ)) دەڵێـت: ((هەرزەكار پێویستی ڕبەڕابەرایەتی هەیـە، دەبـێ ڕێـز لـە هەستی بگـیرێت وبـیر لـە دەروونی بكرێتەوە وبۆ ڕێبازێكی ڕاست ئاراسته بكرێت.)).

هەرزەكار وەكو منداڵ نی یه هەموو داب ونـەریت ورەوشـت وئامۆژگـاری وڕابەرایـەتی بـەبێ سەلماندن قبووڵ بكات، ئەوی نەچووە دڵـی قبوولـی ناكـات ودەكەوێتـە ویـزەی ڕەخنـەگرتن، لەپێشەوە ڕەخنە لەشێوازی پەروەردە وژیان وكرداری دایك وباوكی دەگرێت ودەیەوێت بـەبێ بۆچوونی خۆی پوختیان بكات. ((طه حسين)) نووسـەری گەورەی میسر دەڵێت: (( هەرزەكار شۆڕش لە دژی كارو بیرو ڕاو داب ونەریتی بـاوكی هـەڵ دەگیرسـێنێت.)). پاشـان دەكەوێتـە ویژەی كۆمەڵ و هەڵی دەسەنگێنێت و لە گەڵ كۆمەڵانی دەرەوەی بەراوورد دەكات، ئەمـەش دەكات تاكو خۆی بسەپێنێت كە مەردومێكی ڕاست و پێش كەوتووە، هەر بۆیە لاسای نـەریتی بێگانە دەكاتەوە و جلكی جوان و نایاب لەبەر دەكات و خۆی دەخاتە ناو لێ دوان و گفتو گۆ كردن دەربارەی پێش كەوتن، هەتاكو ئەگەر بزانێت هەڵەیەش هەر لە سەر سەپاندنی بـیرو ڕاو ڕەوشتە بالاكانی خۆی سوورە ئەم ڕەوشتە بالایانە بە خۆی تایبەتن و كارو باری ڕێك دەخەن و خۆی لە پێناویان دا بەخت دەكات. باشترین نموونە ئەوە بوو كـە پـەیمانی میسـرو بـەریتانیا لـە ساڵی ١٩٣٦دا هەڵ وەشایەوە داوا لە هەرزەكارانی میسر كرا كە نیشتمان بپارێزن، ئـەوانیش بە خۆ بەخت كردن و بە بێ ترس و لەرز بەشداری شەڕی ((قەنال))یان كـرد. هـەرزەكار زۆر بە توندی و تاكو ماوەیێك پارێزگاری ڕەوشتە بالاكانی دەكات و كە كەوتە ناو كۆنگەڵی ژیان، ئەو ساكە تێ دەگات زۆر زەحمەتە بیان خاتە ڕووەوە، ئەنجا لە لایێك دەیەوێت بە پێـی ڕەوشـتە بالاكانی كۆمەڵ هەڵسوكەوت بكات و لــە لایێكـی تریشـەوە دەیـەوێت لـە ڕاسـپێریەكانی گەوران خۆی لا بە لا بكات، بەم بارە دەروونەش دەڵێن ((Bormono my)). بـە پێـی لێ كۆڵینـەوەی ((محمـد احمـد غـالي))ی میسـری دەر كـەوتووە هـەرزەكاران ئـەم سـیفەتانەی خوارەوەیان بە دڵە: ((سالاری،گەشبینی، هۆشیاری، ناو داری، هاوكاری، دڵسـۆزی، هێمنـی، چالاكی، سەرۆكایەتی، ئازایەتی، خۆشەویستی، ڕاست گۆیـی، كـە لـە مـێردی، بەخشـندەیی، سەربەستی، دیمەنێكی جوان و ڕێك و قۆز و گیانێكی وەرزشانە.)). كە چی ((ترایۆن)) دەڵێت: ((هەرزەكاران كۆمەڵێكی ڕێنمایی و ڕێساو ڕەوشتی بالا دادەنێن و لە سەر ڕۆشنایییان خـەڵك هەڵ دەسـەنگێنن و ڕەخنـەیان لێ دەگـرن، ئەمـەش ئـەوە دەگـەێنێت كـە گەیشـتۆنەتە ڕادەی گەییوە.)). هەروەها هەرزەكار پەنا بەر ئایین دەبات و بە نیگای سەرنج دان و تـێ ڕوانـین و لێ كۆڵینەوە تەماشای ڕێنمایەكانی دەكات، هەندێ جاریش دووچاری دوو دڵی و ڕاڕایـی دەبێـت بە تایبەتی ئەگـەر نـەتوانێت بـە سـەر گـیرو گرفتـەكانیدا زاڵ بێـت. بـە پێـی لێ كۆڵینـەوەی

((جليلاند)) كه به سەر ((١٠٠)) هەرزەكاریدا كرد بوو، به دیار كەوت ((٧٤)) یـان بـاوەڕ به هەڵ ستانی دوایی دەكەن و ((١١)) یان باوەڕی پـێ ناكـەن و ((١٥)) یـان دوو دڵ بـوون ((٣٣)) یان باوەڕ به بەهەشت و دۆزەخ دەكەن و ((١٩)) یان باوەڕیان پێ نەكردن و ((٤٨)) یان دوو دڵ بوون، ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت كه كافر بووین، بەڵكو ئەوە دەگەیێنێت كـه هۆشـیان گەشەی كردووە و هەست به سەر بەستی بیرو ڕا دەكەن، بۆیە پێویستە بـە هێمنـی مامەڵـە لـە گـەڵ هـەرزەكار بكرێـت و هـانی بدەیـن بـە سـەر گـیرو گرفتـەكانیدا زاڵ بێـت و گرێیـە دەروونیەكانی لـه سەر ڕەوشتی ڕێنمایەكانی ئاینەوە شیتەڵ بكەین. هەروەها هـەرزەكار زینـدە خەوی زۆرە، ((پریـوت)) سـاڵی ١٩٢١ زینـدە خـەوی هـەرزەكارانی كردۆتـە دوو جەشـن: جەشنی یەكەم هەرزەكار هەست به مەزنی و هێز و دەسـەڵات دەكـات، هـەرزەكار خـۆی بـە پاڵاوانێكی به هێز دا دەنێت و بـە هانـای لێ قـەوماوان دێـت و ڕزگاریـان دەكـات. ((Day dreams of super iority)) جەشنی دووەم هەرزەكار هەست بە كەمایـەتی دەكـات و خۆی گۆشه گیر دەكات ئەمەش جەشنێكه لـه ماسۆشی كه به زۆری تووشی كچەكان دەبێـت، كچی هەرزەكار هـەدەم بـیر لـە ئـازار كێشـانی خـۆی دەكـات و تـامی لێ دەچێژێـت و پێـی دەحەسێتەوە. زیندە خەو هەروەكو چەكێكی دوو دەمە، دەشـێ خـەیاڵی پـاڵی پێـوە بنێـت بـۆ وەدی هێنانی ئامانجـەكانی و بـەهرە نایابـەكانی سـەر هـەڵ بـدەن و گەشـە بكـەن، ((فیكتـۆر هیكۆ))ی نووسەری مەزن لـه تەمەنی ((١٥)) ساڵیدا دەی وت: ((دەمەوێت ببمە شاتۆ بریان و مەزنتر))، لایەكەی دووەمیش دەشێ هەر بەخەیاڵـەوە كۆشـك دروسـت بكـات و هیـچ ئـەرك نەكێشێت و تام لـەم خەیاڵە بچێژێت، ((Day dreams of in feriority)).

چۆن یاریدەی هەرزەكار دەدەین؟

١- شـارەزایانی پـەروەردە و دەروونناسـان پێشـنیار دەكـەن بـۆ ئـەوەی گفتـو گـۆ لـە گـەڵ هەرزەكاران دەربارەی هەڕەتی هەرزەكاری و نەشوغای ڕەگەزی و گیرو گرفتـە سـۆزیەكانی هەرزەكار بكرێت چونكه زۆربەی تـرس و ئـازار و لادانـی دەروونیـی هـەرزەكاران بـۆ هـۆی نەزانینیان بەم گەشه كردنه دەگەڕێتەوە. ((فالنتاین))ی دەروونناس وا بە بـاش دەزانێـت دایـك یان هاوڕێیەكی گەورە ڕووداوەكانی هەڕەتی هەرزەكاری به كچی هـەرزەكار بڵێـت، چونكـە خەمۆكیی هەرزەكار لـەوە دایە هەرزەكار وا هەست دەكات ئەوی بە سـەری هـاتووە بـە سـەر كەس نەهاتووە و نایەوێت كەس پێی بزانێت. پەروەردەی ڕەگەزی هەر لـه تەمەنی چوار سـاڵان دەست پێ دەكات، منداڵ لـه نێوان (٤ - ٧) ساڵیدا دەسـت بـە پرسـیار كـردن دەكـات بـە مەبەستی ئەوە بازنەی شارەزایی، زانینی فراوان بكـات لـە بابـەت ڕەگـەزەوە پرسـیار دەكـات هەروەكو بڵێت: برای بچووكم لـه گوێوە هات؟ جیا وازی نێوان كوڕ و كچ چیە؟ بـۆ چـی كچی بچووك منداڵی نابێت؟ پزیشك ((صبري القباني)) دەڵێت: ((پێویستە لـە سـەر دایـك و

باوك لە پرسیارەكانی منداڵیان نەترسێن و ئارەزووی پرسیار كردنی تێر بكەن نەوەكو خۆی بە دزیەوە تێری بكات و لە ئەنجام دا تووشی لادان بێت و پێویستە بە ئۆقرە فێری ژیانداری رەگەزیی شیاوی بكەن.)). منداڵ كە لە بابەتی رەگەزەوە پرسیار دەكات، نیازی خاوێنە و پرسیارەكانی سادە و ساكار و ئاساین، بۆیە دەبێ تەریق نەكرێتەوە و بە قسەی رەق وەڵام نەدرێتەوە، دەشێ بە ناچاری بێ دەنگ بێت، بەڵام تەماشای رەگەز دەكات هەروەكو شتێكی بەدد بێت و كە گەیشتە هەرەتی هەرزەكاری هاڤركێ نێوان رووكاری رەگەز بەددی و چێژی رەگەزی روو دەدات، دەشێ لە ئەنجامی ئەم هاڤركێ یەدادو و چاری تاكسایی رەگەزی بێت. ئەوەی راستی بێت گرێی لەش بەددی هەر لە منداڵیەوە رەگی لە ناو دەروونی منداڵ دادە كۆتێت، لە رووالەتەكانی ئەم گرێیە خاوەنەكەی بایەخ بە چێژی راستی رەگەزی نادات و لە جیاتی ئەمەش چەند چەمكی چەوت دەر بارەی رەگەز بە سەریدا دەسەپێن و ژیانی نابووت و تاڵ دەكەن. منداڵ ئارەزووی بۆ زانین گەرمە، خۆ ئەگەر ئەم ئارەزووە بەر بەست كراو بۆ سادەترین هەڵسوكەوتی سەر زەنشت و لۆمە و ریسوا كراو هەڵسوكەوتەكەشی خرایە ناو بازنەی گوناهی و شوورەیی، ئەم كارەش دەبێتە مایەی چەسپاندنی چەند گەیاندنێكی چەوت لە ناو دەروونی لە عاستی بابەتی رەگەزیدا و بە ترسەوە تەماشای دەكات و بە بەددیشی لە قەڵەم دەدات و هەستیش بەتاوانباری دەكات تەنها ناوی بێنێت. ((صبري القباني)) دەڵێت: ((كە منداڵەكەت دەستی بۆ ئەندامانی زاوزێی برد و تەماشانی كرد، تەریقی مەكەوە نەوەكو دووچاری گرێی لەش بەددی بێت و ئەم گرێیەش لە ناو دەروونیدا بمێنێت و بۆ ژیانی هاو جووتیی درێژ بێت و بایەخ بە چێژی رەگەزی نەدات و لە دوای جووت بوون دا هەست بە تاوانباری بكات.)). باوكی زیرەك دەتوانێت لە كاتی گەران و سووران و گەشت كردن لە گەڵ منداڵەكەیدا و پاش پرسیار كردنی دەر بارەی ئەو شتانەی كە دەی و رووژێنن و سەرنجیرادەكێشن بە مەبەستی ئەوە بگاتە نهێنیەكانیان فێری هەندێ بابەتی رەگەزیی شیاوی بكاتەوە، وا باشە بۆ بە خێو كردنی گیانەوەری دەسەمۆ هانی بدات و چۆنیەتی ژیانیانی بۆ باس بكات، ئەویش سەرنج دەداتە رەوشتیان و چۆن زاوزێ دەكەن و لە ئەنجام دا تێ دەگات كە رەگەز پرۆسێسێكی سرووشتیەیە و بنەچەی مانەوەی چەشنی ژیانە و مەبەستی چڵكنی تێدا نیەیە و لە هەمان كاتیش دا فێری داوێن پاكی و ئابروو بەرزی دەبێت، كە واتە پەروەردەی راستەقینەی رەگەزیی یاریدەی هەرزەكار دەدات بۆ دەر چوونی لە هەرەتی هەرزەكاری بە لەشێكی پتەو و دەروونێكی ساغ و ئامادە بوونی كاریگەر بۆ ژیانی داهاتووی.

٢- منداڵێك هەست بە خۆشەویستی نەكات و باوەری بە خەڵك كەم بێت و لەگەڵیان نەگونجێت و هەروەها هەست بە ناحەزی و وشكایەتی نێوان دایك و باوكی كرد و لەبەر ئاشووبەی خێزان و نەگونجانی دایك و باوكی لە گەڵ یەكتری گیانی پر لە غەم و پەژارە بێت

که گەیشتە هەرەتی هەرزەکاری بە چاوی سووك و ڕیسوایی تەماشای دایك و باوکی دەکات و لێیان لاسار دەبێت چونکە هەست بە شووڕەیی و ترسان و کەم بەهای ژیان دەکات و زۆر زەحمەتیشە لە گەڵ برادەرەکانی بگونجێت. ئەوەی ڕاستی بێت هەرزەکار دەیەوێت خۆشەویست بێت، ئەم خۆشەویستی‌یەش جیایە لە گەڵ خۆشەویستی لە هەرەتی هەرزەکاری‌دا، چونکە ناتوانێت قۆرت بخاتە بەر سەربەستی خۆی دکتۆر ((مصطفى فهمي)) دەڵێت: ((ئەم خۆشەویستی‌یە مایەی سەرکەوتنی لە ژیانی هاوسەری‌دا دەبەخشێت.)). جارێك نوژدارێك ئەم چیرۆکەی خوارەوە دەگێڕێتەوە دایکێك و کوڕە ((١٤)) ساڵانەکەی دەچنە لای، دایکەکە نەسرەوت و پەست و ناڕەزای‌یە لە مامەڵەی کوڕەکەی کە گوێ ناداتە ئامۆژگاریی و لە خۆی و لە دایکی و لە خەڵك بێزارە و هەروەکو بیەوێت هێرش باتە سەر گێتی، لەو کاتەدا منداڵەکە بە کتوپڕی دەکۆکێت، ئەنجا دایکەکە وەکو دووپشك پێوەی بدات هەڵسایە سەر پێ و دەستی بە سەر کوڕەکەی‌دا هێنا و ماچی کرد و پێی وت: نەخۆشی بابچینەوە کوڕەش لە پێشەوە بێ دەنگ بوو و دەستی دایکی لە خۆی دوور خستەوە، بەڵام دایك زیاتر شێوا،لە دوایی داکوڕەکەوتی: من نەخۆش نیم وپێویستیم بە ئیسراحەت نی‌یەووازم لێبێنە. نوژدارەکەش تێ گەیشت بێزاری منداڵەکە سەبارەت بە ئاوەڕدانەوێکی لە ئەندازە بە دەری دایکەکەیەتی. دایك هەروەکو منداڵی ساوا مامەڵەی لە گەڵ دەکات، کوڕەشی هەروەکو بە دایکی بڵێت: گەورە بووم، و بوومەتە پیاو، لێم گەڕێ با سەربەست بم. ((نوال السعداوی)) دەڵێت: ((با دایك و باوك تێ بگەن کە خۆشەویستی یان بۆ منداڵیان هەروەکو دەرمانە، ئەگەر زیاد بوو دەشێ بی‌کوشێت، چەند دایك هەن بەلکان و خۆشەویستیی توندیان منداڵەکەیان دەکەشن، هەر چەند زوو منداڵ لە وێنەی دایکی‌یەوە سەربەست بێت ئەوەندە خەیاڵی پێ دەگات و سەربەست دەبێتەوە.)).

٣- منداڵێك هەست بکات کە بەرخێکی ڕەشە لە نێوان بەرخە سپی‌یەکان دا، واتە ئاستی کۆمەڵایەتی و ئابووری و زانستیی لە منداڵەکانی تر کەمتر بوو، کە گەیشتە هەرەتی هەرزەکاری هەست بە تەنیایی و گۆشە گیری دەکات و لە دوا ڕۆژی‌دا دەترسێت و لە خۆشەویستی و ژن هێنان و کارو باری ڕەگەزی‌دا سەرناکەوێت، چونکە بیری سەر خۆی بەدد بووە، بۆیە دەبێ نەهێڵین هەست بە کەمایەتی بکات و بایەخ بە ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بدەین و هەر دەم هانی بدەین نەك تیرو توانجی تێ بگرین و ستایشی بکەین نەك بە چاوێکی سووك تەماشای بکەین، هەرزەکار زۆر هەستیارە و زوو هەستی ناسکی دەتەزێت، کارێکی مرۆڤانەیە ئەگەر دەستی بگرین و یارمەتی بدەین و ڕێزی لێ بنێین تاکو پشتی بە خۆی ببەستێت و بتوانێت ئەم هەرەتە بە هێمنی ببڕێت، چونکە زۆربەی نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان لەم هەرەتەدا تەشەنە دەکەنەوە بۆ ئەوەی ئەم بەستەزمانە دووچاری یان نەبێت دەبێ ببینە هاوڕێی نەك دوژمنی.

٤- لەم هەرەتەدا گیانی کۆمەڵایەتی بە وێنەیێکی ئاشکرا سەر هەڵ دەدلت، بۆیــە دەبێ ئـەم گیانـە هان بدرێت و هەرزەکار خۆی لـە ناو رێکخراوێکــی کۆمەڵایـەتی و وەرزشـی و وێژەیـی و زانسـتی سوود بەخش دا رێك بخات، بە پێـی لێ کۆڵینـەوەێك کـە دەربـارەی ((١٤٠٠)) کچـی لـە نێـوان ((١١ ١٧)) ساڵی تەمەنی‌یان دا کرا بە دیار کەوت کە تەمەنی((١٣)) سـاڵی بـۆ رێـك خسـتنی کچ ناو کۆمەڵەکان تەمەنێکی شیاوە، هەرزەکاری کوریش پەیرەویی ژینامـەی پاڵەوانـەکان دەکـات و ئەم ئارەزووی بە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە تێر دەکات. هـەرزەکار دەیـەوێت بـۆ خـۆی برادەرەکـانی هەڵ بژێرێت و لایان خۆشەویست بێت و بە پێـی خواسـت و ئارەزوویـان هەڵسـوکەوت بکـات و خۆی لە نێوانیان بچەسپێنێت و لێیان جیا نەبێتەوە، بۆیە دەبێ رێز لـە ئارەزوو و خواسـتی بگـیرێت و خۆمان لـە کارو باری‌دا هەڵ نەقورتێنین، تەنیا ئەگەر تووشــی بـرادەری بـەدد خـوو بێـت، چونکـە برادەری بەدد خوو هەروەکو خەڵووز وایە ئەگەر نەی سووتێنێت رەشی دەکاتەوە. هــەرزەکار حـەز دەکات خۆی بە دیار بخات و لـە ناو کۆمەڵ‌دا بە دیار بخات خاوەن پایــەی خـۆی بێـت و لــە نێـوان هاورێ یانی بە هاو بەهرەی هەبێت و لـە قوتابخانەدا ســەرکەوتوو بێـت، بۆیـە دەبـێ هـان بدرێـت و پشتی بگیرێت و بواری بدرێت. ((بار تروج و دنکولی)) بە لێی کۆڵینەوە بە دیـاری خسـتووە ئەگـەر هەرزەکار بە دیەن رێك بێت و بلیمەت و زیرەك و ساڵار بێت و خاوەن پایەی کۆمەڵایــەتی بێـت و کەسیەتیی هاوسەنگ و پتەو بێت و لـەشی ساغ بێت، دوور هەرزەکار کارێك بکـات، چونکـە کـار خامۆشی دەکات و پێی هەست بە گیانێکی خنجیلانە دەکات و پشتی بەخۆی دەبەسـتێت و هەسـت بە گیتی‌یەکی فراوان دەکات. ((ژان ژاك رۆسۆ)) دەڵێت: ((پێویستە هــەرزەکار کـارێکی بـە سـوود بکات و وەرزش لـە ناو هەوای بــەرەڵلادا بکـات، چونکـە ئەگـەر لـەش و هۆشـی خـەریك بـوون ناخرۆشێت و ئەنێشەی هێمن دەبێت و ویژدانی خۆشنوود دەبێت و لـە مەترسـی تـەپ و تـەوەزەلی و بۆشایی دوور دەکەوێتەوە.)). بۆیە دووبارە دەی وت: ((پێویستە ئەمیل هــەروەکو جووتیـار کارمـەند و وەکو پتیۆڵ بیکار بێت.)). بۆ هەڵ بژاردنی کارێك بۆی دەبێ ئەمانــەی خـوارەوە رەچـاو بکـەین:

(١)خواست و ئارەزووی (٢)رادەی زیرەکی توانای

(٣)ئارەزووی کەس و کــاری و بـاری خـێزانی (٤)بـازاری کارەکـە و بـاری کرێـی (٥)پێویسـتی کۆمەڵ

(٦)مەرجەکانی سەرکەوتنی لـە پیشەکەدا، ئەو ساکە خۆی و کەس و کاری و نـوژدار و قوتابخانـە و خاوەن کارەکە و دەزگای رابەریی پیشــەیی لــە هــەڵ بژاردنـی کارەکـەدا بەشـداری دەکـەن و لــە شارەزایی و توانا و تەندروستی و ئاســت و رەوشــت و کەسـیەتیی تبۆژنـەوە تـاکو لـە کارەکـەی‌دا سەرکەوتوو بێت.

٦) وا باشە هەرزەکار خولیایەکی‌هەبێت تاکو خۆی بنیات بنێت و ویژدانی پێـی بحەسـێتەوە، چونکـە هەروەکو وتراوە: ((مێشکی بە تاڵ ئەشکەوتی ئیبلیسـە.)). واتە ئەگەر خۆی بەشتێکی سوود بــەخش

خەریك نەكات و كاتەكانی بە فیرۆ و خۆڕایی بباتە سەر ئەڵبەت دووچاری گـیرو گرفتـی دەروونـی دەبێـت، باشـترین خولیـا خـۆی بـەڵێ كۆڵینـەوەی زانسـتی ڕۆشـبیر و پـەروەردە بكاتـەوە. نـوژدار ((سپۆك)) دەڵێت: ((هەرزەكار حەز لەوێژە و هونەر دەكات و وا باشە پێیـان خـەریك بێـت.)). بـا مێژووی وولاتی خۆی بخوێنێـت و فـێری زمـانێكی بێگانـە بێـت، بـا پـەرتووك و گۆڤـار و ڕۆژنامـە بخوێنێت، چونكە لاوی ڕۆشنبیر بە دەگمـەن پێـی دەخلیسـكێت، بـا خـۆی بـە بـیروڕای پـاوە نـاو دارەكانی گێتی ڕەوشەن بكات و ویژدانی پەروەردە بكات، چونكە خاوەن ویژدانی پاك دەگونجێـت و گیانی پڕە لە هەستی مرۆڤایەتی و پیاوەتی و دوانێ پاكی و بـەزەیی. بـە پێـی ڕای مامۆسـتا ((سـەلامە موسی)): ((مەردوم هەر چەند ڕۆشنبیر بێت ئەوەندە زیاتر داوای بالایەتی و تەواوی دەكات.)). بۆیـە دەبێ هەرزەكار ڕۆشنبیر بێت.

٧) هەرزەكار ڕێز لەو كەسە دەنێت و لە قسـەی دەر نـاچێت كـە بـە دڵـی چـوو بێـت و خۆشـی بوویت، بۆیە دەبێ پەروەردكاران باشترین نموونەی نایابی ڕەوشتە بالاكانی بـۆ بـبن و نموونـەی باشـی فێری ڕەوشتی باشی بكەن. دكتور ((فرالك فارلی)) لێكۆڵینەوەیێك بە سەر ((٣٤٠)) قوتابـی‌دا كـرد بۆ ئەوەی ((٥)) نموونەی بالایی لە ژیانیان دا هەڵ بژێرن، دیتـی: زۆربـەیان دایـك و باوكیـان هـەڵ بژارد ناوبراو دەڵێت: ((ئەگەر لە ژیانی‌دا نموونەیێكی بالایی هەبێت، هەست بە دڵنیـایی دەكـات.)). هەروەها ((كۆنفۆ شیۆس)) دەڵێت: ((منداڵمان چەرخی ئێمەین، بـەڵكو منداڵـی چـەرخی خۆیـانن، بۆیە دەبێ بە پێی چەرخیان مامەڵەیان لە گەڵ بكەین.

٨) ڕێبازی توندی پەروەردەی دایك و باوك و خۆ هەڵ قورتاندنیان لـە كـارو بـاری هـەرزەكاردا و تێر نەكردنی مەبەستەكانی ئەمانە هەموویان دەبنە مایەی بێزار بوونی هەرزەكار لە ماڵەوە، كە چی بـە پێی ڕای ((جۆنز)) هەرزەكار لە مانەی خوارەوە لە قوتابخانەدا بێزارە:-

أ- ئەگەر مامۆسـتا ڕایـەكی هەڵـەی بەرامـبەر هـەرزەكارێك هـەبێت، ئـەویش بـێزار دەبێـت و ناتوانێت ئەو ڕا هەڵەیە لە گەڵ باری دەروونی‌دا بگونجێنێت.

ب- لەركە زۆرەكانی قوتابخانە و بە دیار نەخستنیان بە شێوەیێكی ئاشكرا.

ج - بایەخ دانێكی لە ئەندازە بەدەر بە ڕژێمی تاقیمانە و نمرە دانان.

ء- شۆر كردنی جڵەوی قوتابخانە بۆ كۆمەڵێكی كەم لە قوتابی‌یان و نەبوونی داد لە قوتابخانەدا.

هـ-سزادانی هەرزەكار بەبێ ئەوەی بە تاوانەكەی بزانێت.

و-گرانی بەرنامەكانی قوتابخانە دووریان لە ئارەزووی و خواست و دەروونی هەرزەكاردا.

ز-چەوتی شێوازی وانە وتن و دووری وانەكە لە ئاستی هۆشی‌یەوە.

بۆیە دەبێ مامۆستا شارەزاییێكی زۆری لە زانسـتی دەروون دا هـەبێت و هـەموو بارەكـانی دەروونـی هەرزەكار تێ بگات، ئامانجی چارەسەر نەك سـزادان بێـت و بـە شـێوەیێكی پەروەردانـەش وانەكـەی

بخاته روو و رابەری ویژدانی بکات ونەك تەنها هۆشی پربکات ،بایەخ بەبەرنامەکانی قوتابخانە بدرێتـو بۆ پێگەیاندنی هەرزەکار بلوێن.

(۹) کە هەرزەکار لەماڵ و قوتابخانە بێزار بێت، ئەنجا دەکەوێتە سەر شەقام، ئـەویش بریقـەدار و هـەڵ خەڵەتاوەیە، هەرزەکاریش بێ ئۆقرە و ئارامەدەشێ دووچاری لادان بێت بە تایبـەتی ئەگـەر تووروشـی هاورێ و برادەری چەتوون بێت. هەرزەکار جگـەرە دەکێشـێت یـا ئـەوەتا بـێزارە یـان یـاخی بـووە سەبارەت بەوە رێز لە کەسیەتی ناگیرێت، ئەویش ئەمە دەکات تاکو خۆی پێشـان بـدات کـەپیاوە و دەبـێ شـوێنێکی هـەبێت وئیـتر نابێتـە بەندو کۆتەی خەڵك. نوژدار ((یوسف مراد)) دەڵێـت: ((هـەرزەکار جگـەرە دەکێشـێت و حەزیشـی لێناکـات، بیـانووی ئـەم رەفتارەشـی خۆپەسـند و سەربەستی‌یە، خۆ ئەگەر پـەروەدکاران دانیان پـێ نـەنا، دەشـێ سەرکەشـی و سـەرپێچی لـە ئـەوان و لـە کۆمـەڵ بکـات.)). کـە چـی پرۆفیسـۆری فەرەنسی ((پۆل فریـوەر)) لـە زانکـۆی ((بۆردوا)) رای گـەیاندووە کـە کچـە هـەرزەکارەکان سـەبارەت بـە چـاو لێکەری و بێ ئیشی جگەرە دەکێشن.



(۱۰) کۆمەڵێك لەسەر رێبازی جیابوونەوەی هەردوو نەژاد لەیەکتری راوەستا بێت و جیهان بۆ پیاوان بێت و دەرفەتیش نەدرێتە ئافرەتان بۆ وەرگرتنی رۆڵەی کاریگەری خۆیان ئـەم جیابوونەویـەش دەبێتە مایەی پلیشانەوەی هەرزەکار و خۆی لەناو ژوورێکدا گۆشـە گـیر بکـات و تارمـاێکی رەش بەسەری‌دا بکێشرێت و کاوێژی پروو پووچ بکات و کە چاوی بە کچێك بکـەوێت دڵ و دەروونـی بشێوێت و گیانی بهەژێت و نەتوانێت چۆن مامەلەی لەگـەڵ بکـات سـەبارەت بـە سـەپاندنی چـەند گەیاندنێکی ناوێزە بەسەری‌دا لە عاستی نەژادی مێینـەدا، هـەروەکو نـرخ نـەدانی ئـافرەت و کـەم کردنەوەی پایـەی لەلایـەن کۆمـەڵداو ئامێزێکـە بـەپێی ئـارەزووی نـەژادی نێرینـە هەڵبـسوورێت، ئەمانەش هەمووی جەبتە مایەی کپ کردنەوەی ئارەزووەکانی و دەربرینیان بە شێوەیێکی تاکسـایی و ناوێزە، دووریـش نی‌یـە هـەر نـەژادێك تەی‌ماشـای یـەکتر بکـەن هـەروەکو ئـەندازەیێك بـن و بـۆ شووکردن دانرابن، نەك مەردومێکن خاوەنی نرخ و پایەی خۆیانن لەناو کۆمەڵدا، ئـەم ئـەم چەشـنە کۆمەڵـە وا لـە هـەرزەکاری کچیـش دەکـات کـە نـەژادی نێرینـە بـە درنـدە دابنێـت و لێـی

دووربکەویتەوە، بۆیە دەبێ خویندنی تێکەڵی کوڕ و کچ هەر لە منداڵیەوە هان بدرێـت و لەسـەر گونجان لەگەڵ یەکتری ڕابێن وتێ بگەن کە هەردوو نەژاد بۆ سەرکەوتنی مرۆڤایـەتی هـەوڵ دەدەن و تەواوکەری یەکترن.

بۆ ئەوەی هەرزەکار بەسەر کەوتووانە ئەم هەڕەتە بباتە سـەر، ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە دەخەینـە بـەر چاوی:-

(١)بایەخ بە تەندروستی خۆی بدات و چالاکیەکانیشی بـۆ بـەرژەوەندی کۆمـەڵ و خـۆی بخاتـە کارەوە و خۆی بنیات بنێت و کەسیەتی پەروەردە بکات.

(٢)بە پێی ڕێنمایەکانی ئایین ڕەوشتی پوخت بکات و لە پێناوی پاراستنی ڕەوشـتە باڵاکـان دا ڕەنـج بدات و تێبکۆشێت، چونکە لە گوناهیی دوور دەخەنەوە و هێمنی دەکەنەوە وتێ دەگـات کـە هێزێك هەیە پشتی دەگرێت و لە کۆسپ و گەرداوی ژیان دەی پارێزێت.

(٣)پێویستە ڕێز لە خۆی بنێت و خەڵکیش ڕێزی دەگرن، با هەرزەکار بزانێت کە نــە منداڵــەو نـە پیاوێکی پێ گەییوە بەڵکو بە قۆناغێك لـە تەمـەندا تێدەپـەڕێت بـۆ ئـەوەی بەرهەڵسـتی ژیـانی داهاتووی بکـات و هەڵسـو کەوتی سـەیر و ئەنتیکـەی و تێگرتنـی تـیرو توانـج بـە خـەڵك و لاساکردنی نەریتی بێگانەو گەوران سووکی دەکەن، با بزانێت کچ سـەودای لاوی هاوسـەنگ و ژیر و داوێن پاك دەبێت و بە چاوێکی سووکەوەش تەماشای هەرزەکاری سووك و گـەوج و تەپ و نامەرد و زمان شڕو بەد فەڕ دەکات، کوڕیش سەودای عازەبی لێهاتوو و هاوسـەنگ و بە ئابڕوو و ڕەوشت پاك و ژینامەی خاوێن دەبێت و ڕێزی لێ دەگرێت، بۆیە دەبێ هـەرزەکاری کوڕ کەڵە مێردی وسـوار چـاکی و پیـاوەتی لـە هـەموو بوارێکـی ژیـان دا بنوێنێـت، کچیـش هەمیشە بۆ ناوداریکی خاوێن تێبکوێشێت، چونکە باشترین گەنجینەیـە لـە گێتـیدا، بـا بزانێـت کچی سووك هەروەکو پارچە پەڕۆیەکی شـڕ فڕێدەدرێتـە سـەر شـەقام و دەکەوێتـە ژێـر پێـی هەموو نا مەردێك.

(٤)بۆ ئەوەی هەرزەکار باوەڕی بە خۆی پتەو بێت، پێویستە ئەمانە بکات:-

أ- لە گۆڕانەکانی لەشیدا نەخرۆشێت و نەشێوێت.

ب-بە ڕەخنەگرتن و لۆمەی خەڵك نەشێوێت و نەورووژێت و هەوڵ بدات ئـاوی ڕوومـەتی نـەتکێت و بوار نەداتە خەڵك بە چاوی سووك تەماشای بکەن و کـەمو کووڕیـەکان هـەڵ بـدەن قـەت بـە واڵەی ئەم و ئەو نەکەوێتە مەلەوانی، گرنگ لەوە دایە ڕێی ڕاست بگرێت و بایەخ بەواتـەی خـەڵك نەدات.

ج-باتێ بگات سەرکەوتن ماندوێتی وسڵ بوون و تەمبەڵی نازانێت سـەرکەوتن لەسـەر ڕۆخـی بەلەدرێك ناحەسێتەوە بەڵکو سـەرکەوتن سـەرکەوتن ڕادەکێشـێت. ((Nothing Leads to success than success it self)) بۆیە هەمیشە وێڵی سەرکەوتن بێت و بیکاتە سـروودێك بـۆ

گیانی، چونکە هەموو کەسێك ڕێز لە مەردومی سەرکەوتوو دەنێت، بە سەرکەوتن باوەڕی بــە خۆی پتەو دەبێت و دەبێتە قەلاَیەکی توند و کەس زەفەری پێنابات.
د-بە چاوێکی گەشبینی تەماشای ژیان بکات و بیر لە سەرکەوتن بکات، نەك بیر لە سڵ بــوون و کۆڵ دان، باشترین ڕێباز بۆ زاڵ بوون بەسەر ژێر کەوتن دا ئەوەیە لە بیری بکــات و دووبــارە دەست بە کۆشش بکات، ژیان قوتابخانەیە، ئەوەی ئێمڕۆ لێی بێزارە، بــەیانی هــەروەکو پردێــك بەسەری‌دا تێ‌دەپەڕێت و لە بیری دەکات و بەهێز تــری دەکاتــەوە، بــا بزانێــت ژیــان پــڕە لــە ڕووداوی کتوپڕی، ئەوەی هەوڵ بدات قەت ڕەنجی بە بادا ناڕوات، ئەوەی تێ‌بکۆشێت ئەلبەت سەردەکەوێت، ئاسوودەیی لە کار کــردن و ڕاژە کردنــی خــەڵك دایــە، هــەر چــەند مــەردوم بەخشینی هەبێت ئەوەندەش ئاسوودەیە، بەخشینی مەردومیش لەماڵــەوە دەســت پــێ دەکــات، هیچ ویژدان نییە کچی هەرزەکار خۆی ئاراشتە بکات، یان تەماشــای تەلــەفزیۆن بکــات، یــان پەرتووکێکی دڵداری بخوێنێتەوە، دایکە بەستەزمانەکەشی خــەریکی کــاری نــاو مــاڵ بێــت، بــا کاتەکانی بۆ ڕێــك خســتنی مــاڵ و خزمــەت کردنــی ئــەندامانی خــێزان و خــەریك بــوون بــە خولیایەك دابەش بکاتەوە، مەرج لەوە دایە بتوانێت چۆن کاتــەکانی بــە شــتی کــەڵك بباتــە سەر، ئەو ساکە نە بێزاری، نە تووڕەیی، نە خاوی، نە گێرو گرفت لــە فەرهــەنگی‌دا دەبێــت و ئەو ساکە بە بێ تەلەزگە دەتوانێت ئەم هەرەتە ببڕێت و بۆ ژیــانێکی پتــەوی داهــاتووی ئامــادە دەبێت، چونکە چۆن هەرزەکار بێت ئەوهاش خاوەن پیشەو هاوسەر دەبێت، واتــە هــەرزەکاری سەر کەوتوو لە پیشەو ژیانی هاوسەرێتیی‌دا سەر کەوتووە.

## بەندی هەشتەم

—((شوێنی منداڵ لە زنجیرەی منداڵانی خێزانێك دا))—

پەروەردکاران زۆر بایەخ بە زنجیرەی خێزانێك دەدەن، چونکە باری دەروونی دایك و باوك لــە عاستیان دا دەگۆڕێت و شێوەی مامەڵە کردن لە گەڵیان دا جیا دەبێت، دەشێ یەکێکیان جێــی ڕەزامەندی بێت و لە ئەندازە بەدەر ئاوڕی لێ بدرێت و زیاتر بەناز بکرێت، هاودژی ئەمەش لــە عاستی منداڵێکی تریش دا بێت. هەندێ خێزان جیا وازی نێوان نێرو مــێ دەکــەن و یــەکێکیان زیاتری خۆش دەوێن لە ئەوی تر، هەندێ جاریش خێزانێك حەز دەکــات کچــی هــەبێت، خــۆ ئەگەر خوای مەزن کوڕی داێی لە سەر شێوازی کچ دا بەخێوی دەکات و پرچی درێژ دەکــات و جلکی کچانەی بۆ ساز دەکات و وێنەی بۆ دەگرێــت و لــە نــاو مــاڵ‌دا هــەڵی دەواسێــت،

ئەمەش كارێكی نارەوایە، چونكە ئەم كورە دەشێ خاسیەتی مێینە وەربگرێت و بەختیاریی لێ دووره پەرێز بێتەوە، خێزانێكی تریش دەیەوێت كوڕی هەبێت بەڵام خوای مەزن كچی دایێ، دەشێ لە سەر شێوازی نێرینەدا بەخێوی بكات، باشترین نموونە لە مێژوودا ((كرستینا)) شاژنی ((سوید)) بوو، كە تاقە كچی باوكی بوو، هەر لە منداڵی‌یەوە فێری ڕەفتاری كوڕانەی كرد تاكو شوێنی خۆی سەر تەختی شایانە بگرێتەوە. ((كرستینا)) بەختەوەر نەبوو، هەر چەندەكیش لای خەڵك خۆشەویست بووە و خاوەنی دەسەڵات و پایە بووە، ((ئەدلر)) دەڵێت: ((شوێنی منداڵ بە گوێرەی خێزانێك كار دەكاتە سەر ڕەوشت و هاوگونجانی.)). كە چی ((فلۆجل)) دەڵێت: ((شوێنی منداڵ بە گوێرەی زنجیرەی خێزانێك كار دەكاتە سەر پەیوەندیی بە برایەكانی و ماڵ و كۆمەڵ.)).

١- منداڵی نۆ بەرە و گیرو گرفتەكانی:- زۆر لە دایك و باوك دانیان ناوە، گوایە بەختیاری لە منداڵی نۆبەرەیان دووره پەرێزه و دەڵێن: ((منداڵەكەمان شەرمن و دەركەنارە و لە گەڵ خەڵك دا شاد نی‌یە و لە گەڵیان ناگونجێت و لە ناو منداڵان دا هەست بە غەریبی دەكات و لە منداڵە گەورەكان دەترسێت و لە گەڵ بچووكەكانیش دا ناسازێت و لە یاریدا بەگۆزەرە و ئاژاوەچی‌یە و دەیەوێت دەسەڵاتی بە سەریان دا بسەپێنێت و خۆی بكاتە تەوەرەی یاری‌یەكە، بۆیە لێی دوور دەكەونەوە و هەروەها دەزانێت ستەمی لێ دەكەن، دەیەوێت بۆ خۆی سەرنجی خەڵك ڕابكێشێت، بەڵام هەڵسوكەوتە بەددەكانی بە كەم ڕەوشت و بێ تام لە قەڵەمی دەدەن، زۆریش هەستیار و بە دەمارە و دەیەوێت برایەكانی لە ژێر دەسەڵاتی دەرنەچن و هەموویان بە پێی فەرمانەكانی بجوولێن.)). هەروەها دەڵێن: ((زۆر پێمان بەستراوە بەرادەیێك سەربەستیی بەند كراوە ە زۆر بە دەگمەن هەست بە لێ پرسیاریی دەكات و لە قوتابخانەدا سەر كەوتوو نی‌یە.)). كە چی ((ولیم .س. منیجر)) دەڵێت: ((منداڵی نۆبەرە خاوەن گیرو گرفتی تایبەتی خۆیەتی و بەرەنگاریی نەسرەوت و هەڵەكانی دایك و باوكی دەبێتەوە سەبارەت بە كەم شارەزایی‌یان بە ڕێبازی پەروەردە و لە بەر بێ ئۆقرەیان ئاگاداری‌یەكی زۆری دەكەن.)).

منداڵی نۆبەرە هەر لە چركەی بوونی‌یەوە هەڵچوون و هەستی هاوپێچەوانە بە ڕووی‌یەوە دەپەرژێن. باوك پێی شادە و هەست دەكات كە لێ پرسراوە بەرامبەر بە پەروەردە كردنی، دایكیشی هەست بە سیفەتە مێینەكانی دەكات و پێی خۆشنوودە. لە لایێكی تریشەوە هەر دووكیان هەست بە كەم شارەزایی‌یان لە ڕێبازی پەروەردە دەكەن و دەشێوێن و نەسرەوت دەبنەوە، ئەم بارە دەروونانەش بە شێوەیێكی نەستی‌یەوە بۆ ئاگاداری‌یەكی لە ئەندازە بە دەریان ڕادەكێشێت. بە بوونی منداڵی نۆبەرە لە زۆربەی بارو دۆخ دا دایك و باوك هەست دەكەن كە سەر لە نوێ لە دایك بووین و هەموو ئاوات و نیاز و ئامانجیان دەخەنە سەری‌یەوە و

دەیانەوێت پێیان بچێت و لە لایەن بلیمەتی و جوانــی و ڕەفتـار و بـەهای کۆمەڵایـەتی و فـێر نامەی لێیان زیاتر بێت، هەروەکو ((پیرە مێرد))ی، نەمر وەتەنی:

هیچ کەس نایەوێ لێی زیاتر بێ          هەر باوك ئەڵێ: کورم چاتر بێ

ئەنجا بۆیە ئارەزوو دەکەن لاسایان بکاتەوە و فێری پیشـەیان بێـت و بـیرو ڕایـان بـە سـەری‌دا دەسەپێنن و خۆیان لە گشت کارو بار و هەڵسوکەوتی‌دا هەڵ دەقووڕتێنن، ئەمەش دەکـەن بـە نیازی ئەوە توانا و کەسیە تی‌ئەم بەستەزمانەبێتەڕوونووسێك لەکەسـیەتی یانبـە بـێ ئـارەزوو و خواستی ڕەچاو بکەن، ئەم ڕووکارە چەوتەش منداڵەکە دەهــەژێنێت و دەپلیشـێنێت و سـەری دەشێوێنێت بەربەست دەکات و لە ئەنجام دا نـاتوانێت ڕێـی پێـش چـاوی خـۆی ببینێـت و بـە ئارەزووی خـۆی پیشـەێك هـەڵ ببژێرێـت و لـە ژیـان دا سـەر بکـەوێت. هـەروەها ڕێبـازی پەروەردەی دایك و باوك کار دەکاتە سەر ڕێبازی پەروەردەی منداڵی نۆبەرە، بۆ نموونە ئەگـەر یەکێکیان وەختی خۆی لە خۆشەویستی بێ بەری کرا بێت یـان نـەزانێت مانـای خۆشەویسـتی چی‌یە، دەشێ منداڵەکەی خۆش نەوێت، چونکە ئەوی بێ بەری لە شتێك کرا بێت ئەڵبەت ئەم شتە نای بەخشێتەوە. کە مەردوم هەست بە تاوانباری بکات کە لە دەرئەنجامی پەروەردەی ڕەق و سەخت پەیدا بوویتەوە، بێ گومان ئەم مەردومــە لــە عاسـتی منداڵـی نۆبـەرەدا هەسـت بـە تاوانباری دەکات ئەگەر داخوازی‌یەکانی فەرامۆش کرد بێت و لە جیاتی ئەم هەستەشـی زۆری خۆش دەوێت و لە ئەندازە بە دەریش ئاگاداری دەبێت، منداڵیش ڕووانگەێکی هەستیاری هەیە بـە دۆخـی دەروونی‌یـەوە دەزانێـت و خـۆی دەکاتـە شـەیتانێکی دڕنـە داگـر و بـــە جـارێ داخاوازی‌یەکانی زۆر دەکات و بە پێی ئارەزووی دەی سووڕێنێت، ئەمەش دەبێتە مایـەی پـەیدا بوونی گرژی و پەستی نێوان خۆی و دایك و باوکی ئەوانیش هەست بە تاوانباری بکەن ئەگـەر بە پێی ئارەزووەکانی نەکەن و لە هەمان کاتیش دا لەم ڕێبازەدا دڵنیانین، ئەنجا لە نێوان تـرس و زاڵ بوون بە سەر ئەم دۆخە دەروونی‌یـەدا لا سـەنگ دەبنـەوە و هـاڵ و هـەواڵیانیش زۆر بـە مەردومێك دەچێت بۆ یەکەمجار فێری سوواری ئەسپ بـوو بێـت و هـەموو دەمارەکانیشـی بـە ترسێکی هەمیشەیی بەسترا بێت، واتە دەترسێت نەکەوێتە خوارەوە، منداڵەکەش ئەم هەموو بارە دەروونی‌یانە بۆ بەرژەوەندی خۆی دەچەوسێنێت و قیژانــدن دەکاتـە یەکـەم چـەکی بـۆ وەدی هێنانی ئارەزووە زۆرەکانی، بیانگە دەگرێت بۆ ئەوەی لە باوەشـیان نەکەوێتـە خـوارێ، خـۆی نەخۆش دەخات تاکو زیاتریان ئەسرەوت بکات، مان لە خواردن دەگرێت تاکو لێی بپاڕێنــەوە، ناخەوێت تاکو لە نزیکیانەوە نەبێت، بە قســەیان ناکـات تـاکو داخوازی‌یـەکانی جـێ بـە جـێ نەکەن      بێ گومــان ئەمانــەش دەبنــە مایـەی لکـاندنی پێیـان و تـەنیا لــە گـەڵیان نـەبێت نەحەوێتەوە و لە گەڵ کەسـیش یاری نەکات و هەوڵیش نەدات بـۆ داهێنـان و لێ کۆڵینــەوە و خۆیشی لە جوانکاری و نایابی دوور بخاتەوە و بێ یارمەتی‌یان هیچ کارێك نەکات، لــە ئـەنجامی

ئەمەش دا سەربەستیی زامن ناکرێت و ناتوانێت خزمەتی خۆی بکات و باوەڕ بە خۆی و بە هیچ کەسێك نەکات و هەروەکو مشەخۆری لێ‌بێت و دەردەسەری بچێژێـت و بـەختیاریی لێ دووره پەرێز بێتەوه، چونکە کەس نی‌یه ئەم هەموو ناز و فیزانه قـوولّ بکـات، بۆیـه سـەرکەوتنی لـه ژیانی دوا ڕۆژی‌دا به دەگمەن دەبێت.

چۆن چارەسازی ئەم گیرو گرفتانه دەکەین؟

١- ڕاسته به بوونی منداڵی نۆبەره دایك و باوك نەسرەوت دەبنەوه، چونکە بەرامبــەر بـه پـێ گەیاندنی مەردومێکی لاواز و بچووك لێ پرسراون، بەڵام دەبێ ئەم نەسرەوتی‌یه بـه دیـاری نەخەن نەوەکو بۆ منداڵەکەیان بتەنێتەوه.

٢- پێویسته لـه سەر دایك و باوك خۆیان ڕۆشنبیر بکەن و بابەتی پەروەردەی منداڵ بخوێنــن و سوود لـه شارەزایی و تاقی کردنەوەی دایك و باوکی ناسیار و دروا‌سی‌یان وەر بگرن.

٣- هەروەکو ئاشکرایه منداڵ لـه میانی سێ مانگی یەکەمی تەمەنی‌یەوه بـه دایکـی بەســتراوه، دوای ئەمەش بۆ جیهانی دەرەوه ئاگادار دەبێتەوه، دایکی هۆزانیش دەتوانێت هێدی هێـدی لـه ڕادەی ئەم بەستنەدا کەم بکاتەوه، هەروەها لـه دوای شەش مانگی تەمەنی‌یەوه دەیەوێت سەربەست بێت، با دایکیش بۆ ئەم ڕێبازه هانی بدات و بە بێ ترس بۆ جموجوڵ و چـالاکی بواری بداتێ، منداڵ دوای سێ ساڵی تەمەنی‌یەوه دەتوانێت چەند کارێك بۆ خۆی بکــات، با دایکیش فێری بکات چۆن خزمەتی خۆی بکات.

٤- شتێکی ئاشکرایه ئەگەر دایك و بـاوك بنـه بـەند و کۆتـەی داخوازی‌یـەکانی منداڵیــان، ئەڵبەت ئەم منداڵه داوی ســتەمیان لێ دەکـات، بـەم ڕووکـارەش تـەنیا فـێری سـەندن و لاواندن و ناز و فیز دەبێت و لـه ئەنجام دا لـه گەڵ خەڵك دا ناسازێت و نـاگونجێت، بۆیـه دەبێ سنوورێك بۆ داخوازی‌یەکانی دابنرێت و فێری ژیان بکرێت که لــه سـەر هـەر دوو ڕێبازی دان و سەندنەوه ڕادەوەستێت و دەبێ بزانێتیش ماف و ئـەرکی چی‌یـه؟ و ڕێـز لــه مافی خەڵك بنێت و خەڵکیش ڕێز لـه مافی بنێن.

٥- نابێ به هیچ جۆرێك دایك و باوك لاوازی و بێ چارەیی و پشێوی و نەسرەوتی لــه پێـش چاوی منداڵیان بنوێنن، با خۆیان بگرن ئەگەر تووشی ناخۆشی هات، بـا بقیژێنێـت ئەگـەر هۆیێك بۆ ئەم قیژاندنه نەبێت، با هانی بدەن بۆ ئــەوەی ڕوو بـه ڕووی ژیـان بوەسـتێت و پەناش بەر دایك و باوکی نەبات تەنیا لـه کاتی پێویستی‌دا نەبێت. ئەگەر لاوازی و تـرس و نەسرەوتی لـه سەر ڕووخساری دایـك و بـاوکی بـەدی نـەکرد، ئـەو سـاکه ناترسێت و نەسرەوت نابێت و هێمن دەبێت.

٦- بـه بوونـی منداڵــی دووەم، منداڵــی نۆبـەره نەســەرەوت دەبێـت چونکـه بەشـداری لــه خۆشەویستیی دایك و باوکی‌دا دەکات و به تایبەتی ئەگەر سەبارەت به منداڵی نوێ دایك

سزای بداتێ. یا داوای لێ نەکات بە هەرەشە خزمەتی برایەکەی بکات بەڵکو هێدی هێدی فێری بکات کە منداڵی دووەم ئەندامێکە لە ناو خێزان دا و هیچ ڕێی نەگرتووە.

منداڵی دووەم و گیرو گرفتەکانی:- پەروەردەی منداڵی دووەم و بـرا بچووکـەکانی ئاسـانترە، چونکە دایك و باوك لە ڕێبازی پەروەردەدا شارەزاتر دەبنەوە و وەکو جارانیش نەسرەوت نـابن و نەرمتر دەبنەوە و زیاتریش سەربەستی دەبەخشـنە منداڵـەکانیان. ئەگـەر منداڵـی نۆبـەرە لـە زۆربەی بارو دۆخ دا جێی ئاورِ دانەوە و ڕەزامەندی بێت و شوێنێکی تایبـەتی خـۆی هـەبێت، منداڵی پاشە بەرەش تا ماوەیێکی زۆر و بێ بەربەرەکانێ هەر بەدوا هێشوەی خـێزان لـە قەڵـەم بدرێت، کە چی منداڵی ناوەند لە هەر دوو پایە بێ بەری‌یە و لـە چـاو برایـەکانی هەسـت بـە فەرامۆشـی دەکـات و بـە توندیـش داوای مافـەکانی دەکـات. لێ کۆڵینـەوەیێکی نووسـینگای نیشتمانی منداڵان لە بەریتانیا بە دیاری خسـتووە کـە مامەڵـە لـە گـەڵ منداڵـی دووەم دا لـە زۆربەی بارو دۆخ دا گران و سەختە و شوێنی نێوان هەر دوو برایـانی پـاڵی پێـوە دەنێـت بـۆ ئەوەی بەر هەڵستی‌یان بکاتەوە بۆ ئەوەی پایەی هەبێت و سەرنجیان بۆ خۆی ڕابکێشێت و هـەر دەمیش لە ناو ماڵدا ئاگاداری بکەن. لە سەرەتای بوونـی منداڵـی سـێیەم دا دەشـێ منداڵـی دووەم تووشی کۆسپ و گرفتـە دەروون بێـت و بترسـێت چونکـە هـاوڕێی لـە گـەڵ بـرای گەورەدا نەبڕایتەوە و نەگەیشتۆتە ڕادەی جێگـیری سـەرباروبن بـاریش خـەنیمێکی نـوێ سـەر شانۆی ژیانی سەری هەڵ-دا. دەشێ خۆی لە بەر مەیدانی برا گەورەی بکێشـێتەوە و بکەوێتـە ویزەی برای بچووکی، ئەنجایا ئەوەتا: بەر بەرەکانێی لە گەڵ دەکات یان گۆشـە گـیر دەبێـت، دەشێ پەنا بەر گەوران ببات تاکو بێ پارێزن بۆ ئەم ڕووکارەشی لاسـای داب و هەڵسـوکەوتی منداڵی بچووك دەکات، هەروەکو بەشەو نووین تەڕ بکات یان پەنجـەی یـان مەمـە بمژێـت یـان داوای مەمکی دایکی بکات، یان هەروەکو منداڵی ساوا بدوێت، لە هـەندێ بـارو دۆخیـش دا منداڵی دووەم هەوڵ و تەقەلا دەدات بۆ ئەوەی بەخشندەی هەبێت و پایەشی لە هەر دوو برای زیاتر بێت. بۆ ئەوەی چارەسازی ئەم گیرو گرفتانە بکـەین بـا ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە ڕەچـاو بکەین:-

١-پێویستە منداڵی دووەم پێشەکی بە بوونی منداڵی سێیەم بزانێت بـۆ ئـەوەی بـە کتوپڕی بە ڕەنگاری خەنیمی نوێ نەبێتەوە.

٢- نابێ بە هیچ جۆرێك منداڵی دووەم فەرامۆش بکرێت و ئاوری لێ نەدرێتەوە.

٣- نەهێڵین دەمارگیران لە نێوان منداڵەکان دا تەشەنە بکات و هەر یەکە بـە پێـی دەروون و خواست و ویژدان و توانای مامەڵەی لە گەڵ بکەین.

منداڵی پاشە بەرە و گیرو گرفتەکانی:- خۆشە لای هەندێ دایك و باوك منداڵی پاشە بـەرەیان هەر بە دوا هێشوەی خێزان دابنێن و بە بێ هاوچاوی هەر منداڵە بچووکەکەی جـاران بێـت و

بۆ ماوەیێکی زۆریش خۆشی لە شێوازی منداڵانەی بچێژن و چاویش لە هەڵە زۆرەکانی بپۆشن و لە ئەندازە بە دەریش ئاوڕی لێ بدەنەوە و ئاگاداری بکەن و خۆشی بوێن. ئەم ڕێبازە پەروەردەیەش دەبێتە مایەی پەیدابوونی دەمارگیران لە نێوان خۆی و برایەکانیدا ئەنجا ئەویش زیاتر خۆی دەکاتە تەوەرەی خێزان و خۆی بەناز دەکات و بە دڕنە داگرتن و گرینۆکی دەیەوێت هەردەم ئاوڕی لێبدرێت و ئارەزووە سەرپەڕەکانی بهێنێتە دی، وە لەبەر ئەمە بە دایك و باوکی بەستراو ولکاوە و پێیان دەپەڕموویت بۆیە هەست بە لێ پرسیاری ناکات و ناتوانێت خزمەتی خۆی بکات و بە دڵ و دەروونێکی قائم و پتەو رووبەڕوویی ژیان بوەستێت. وا بەدیار کەوتووە ئەو منداڵانەی کە تووشی ئیفلیجی و باداری بووبوون و یاریدەی چارەکردنی سرووشتی خۆیان نەداوە چونکە منداڵی پاشەبەرە بوون و لەبەر ئەمە هەستیان بە لێ پرسیاری نەدەکرد. دەشێ منداڵی پاشە بەرە لە چاو برایەکانی هەست بە لاوازی وبێ توانای خۆی بکات، ئەنجا یا ئەوەتا دەیەوێت هەر بە منداڵی بچووکەوە بمێنێت و لە ئاگاداری و ئاوڕدانەوەی دایك و باوکی خۆشی بچێژێت و نەتوانێت ئەم هەستەی بە سەرکەوتن و جوانکاری تۆڵە بکاتەوە بە تایبەتی ئەگەر برایەکانی بە توانابن و بە بەراوردکردنی لەگەڵیان هەستی بووروژێنن و زووش ببەزێت و کۆڵ بدات و گۆشەگیر بێت. یان دەیەوێت بگاتە هاوپایەیان لە بری ئەم هەستەی ئەنجا دەست بەتێکۆشان دەکات و ئەرك دەکێشێت و بەربەرەکانێی برایەکانی دەکات. خۆ ئەگەر دایك و باوکی هانی بدەن ئەوساکە هەموو ووزە و توانای دەخاتەکارەوە و بۆ داهێنان و جوانکاری و نایابی تەقەلا دەدات. هەندێ جاریش وەك بڵێیت ماندووەو زەحمەت دەکێشێت و ناتوانێت هەموو ئاواتی بهێنێتە دی و دەڵێت: کەی گەورە دەبم؟ نووژدار ((جارلزوو))ی ئەمەریکی دەڵێت: ((دەشێ منداڵی پاشە بەرە زۆر ئەرك بکێشێت و بە سەرفرازی کار بکات و حەز لە تەنیایی بکات.)). بۆ ئەوەی منداڵی پاشە بەرە بە ئاسانی وبێ تەگەرە پێ بگات دەبێ هەروەکو منداڵانی تر مامەڵەی لەگەڵ بکەین و لێیان جیا نەکرێتەوە. لە ئافرەتێکی عەرەبییان پرسی: کام منداڵت زیاترت خۆش دەوێت؟ ئەویش لە وەڵام دا ووتی: ئەگەر یەکەیەکە ناویان بهێنم هەر دەڵێم: خۆشیان دەوێم، پاشان واقی وڕماو وتی: منداڵەکانم هەروەکو ئەلقەیێکی بۆش وان نازانم جەمسەری لە



کوێیە؟ هەندێ دایکیش دەڵێن: زگ جیاوازی ناکات و دەبێ هەموو ئـەندامانی خـێزان هـەوڵ بدەن تاکو منداڵی پاشەبەرە پشتی بەخۆی ببەستێت و متمانە بە خۆی بکات و دەرفـەتی بدەنـێ بۆ خۆی ئەرك و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات و کەس خۆی لـە کارو باری‌دا هەڵ نەقوورتێنێت و قەتیش بە بچووك و لاوازی دانەنێن و پەلاماری نەدەن و نەی کەنە دەست و پێوەندیی خۆیان و هانی بدەن نەك قۆشمەی پێ‌بکەن و لـەگەڵی بدوێن و بگونجێن و نەهێڵن هەست بە کەمایـەتی بکات، ئەوساکە هێمن دەبێتەوە و کەسیەتی گەشە دەکات و فێردەبێت بەسەر گیرگرفتـەکانی‌دا زاڵ بێت و بەبێ ترس شان بەر ژیان بدات.

*منداڵی تاقانە و گیروگرفتەکانی:*

لـەزۆربەی بارو دۆخ دا منداڵی تاقانە بەبێ هاوچاوی خۆشەویستی دایك و باوکی‌یەتی و لـەرادە بەدەریش سۆزی بۆ دەنوێنن و بەزەیی‌یان پێ‌دا دێتەوە و بەترسەوە ئاگـاداری دەکـەن و نـاهێڵن ئەرك بکێشێت و زەحمەت بچێژێت و فەرمانەکانی بۆ دەکەن و خۆیـان لـە کاروبـاری دا هـەڵ دەقوورتێنن و ئویش پێ‌یان دەپەرمووێت و لـە ژیان دا بێ ئەرك دەبێتەوە و بەبێ دایك و بـاوکی ناتوانێت هەنگاوێك بۆ پێشەوە بنێت و فێری ژیانی سەخت و گران نابێت و ناتوانێت بـۆ خـۆی بەسەر گیروگرفتەکانی‌دا زاڵ بێت و ڕوو بە ڕووی ژیان بوەستێت، خۆ ئەگەر نەسـاغ بکـەوێت یان تووشی ئازاری هات ئەوەندە دایك و باوکی نەسرەوت دەبن و بۆ خۆیان نازانن چ بکـەن و ئەوەندەش دەترسێت بەرادەیێك دەشێوێن و بەنازی دەکەن و هەرچی‌یەکی ویست بۆی دەکەن، ئەنجا دەبێـتە جەلادی ماڵ و خواستەکانی زۆر دەبن و فەرمانەکانی بەسەریا ندا دەسەپێنێت وبـێ دڵی ناکەن. هەروەکو ((کورد)) وەتەنی: ((فێرکەران فێر مەکە ئەگەر فێرت کردن لـە بیریـان مەکە.)). ((ژان ژاك رۆسۆ))ش دەڵێت: ((منداڵی بەناز دوور نی‌یە داوای چۆلـەکەی ئاسمـانت لێ بکات.)). ئەم ڕێبازە پەروەردەیەش دەبێتە مایەی چاندنی تـرس و نەسـرەوتی دایـك و بـاوك لـەناو دەروونی‌داو گازاووشلی دەخولقێنێت و ناتوانێت بەدڵ و دەروونێکی قائم وپشوو درێژی و خۆ ڕاگرتن و ئارامی شان بداتە بـەر ژیـان بۆیـە خـۆی لـە بەرپرسـیاریی دوور دەخاتـەوە و هەرتەنیا کاری ئاسانی پێ دەکرێت کە گەورەش بوو ناتوانێت لـەسەر فەرمانێك خۆی ڕابگرێـت و بەبێ دایك و باوکی ناتوانێت بە ئاسوودەیی بژێـت. دکتـۆر ((فـاخر عـاقل)) ئـەم ڕووداوەی خەستەخانەی پاشکۆی زانکۆی لـەندەن بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە: لاوێکی ناسکی تاقانـە ی‌دایـك و باوکی کە پەیرەوێکی هەمە چەشنەیان پێ‌دابوو و لـە ژێر سێبەریان دا بـە ئاسـوودەیی دەژیـا، بەڵام زەمان بەختی ڕەش کرد و لـە میانی دوو مـانگ دا دایـك و بـاوکی لـەناو بـرد، لاوەکـە کەوتە ژێر ئاگاداریی پلکی و ئەویش نەی توانی جێ‌یان لـە بەنازکردنی‌دا بگرێت، بەیانی‌یەك کە هەڵسا لـەخەو هەردوو لاقەکانی ئیفلیج بووین و ناتوانێت بیان جوولێنێت، پلکـی پێشـانی زۆر

لە پزیشکیدا، بەڵام هیچ هۆیەکی ئۆرگانی بۆ ئەم ئیفلیجەیان نە دۆزیەوە، بەڵام کە خرایە ژێر تیٚ ڕوانینی دەروونناسێکەوەئەویش ژیاننامەی شیکردەوە و هەڵسا وێسکی دەرخواردیدا تاکو بیٚ هۆشی خست، ئەو ساکە هاواری کرد بە سەریدا و پێی وت: ((هەڵسا، غاربدە، ئەویش بەڕەوانی ئەمەی کرد. دەروونناسەکە دەڵێت: ((لەبەر ئەمە لاوەکە لە زەمانی دایك و باوکیدا بەناز بوو خۆی لە هەموو بەرپرسیارێك کێشابوو کە چووە لای پلکی نەی توانی خۆی لەگەڵ ئەم بارەدا هاوگونجاو بکات و بەنەستییەوە خۆی ئیفلیج کرد تاکو پەیڕەوی پلکی بۆ خۆی رابکێشێت.)).

لە زۆربەی بارو دۆخدا منداڵی بەناز خۆپەرستەو دەیەوێت هەر بۆ خۆی شتی هەبێت و هەر بیریش لە خۆی دەکاتەوە، بۆیە بەخشینی کەم دەبێت و هاوکاری و یارمەتی و خۆبەخت کردن وراژە و ڕێزگرتنی هەستی خەڵك و کەس و کارو ناسیاو لە فەرهەنگی ئەم منداڵەدا شوێنیان کەمە، ئەنجا کە منداڵێك بیٚ ئەرك و خۆپەرست و ترسنۆك و مشەخۆر و چەقاوە سوو بوو و تەنیا هەر خزمەتی بکرێت وهەر فەرمانیش بەسەر خەڵك دا بکات ودڕنە دابگرێت، ئەڵبەت کە گەورە بوو هەروا دەبێت، پەروەردکاران دەڵێن: ((کچی بچووکی بەناز، هاوسەرێکی بەنازە.)). ئەوساکە کیٚ دەتوانێت نازو فیزی ئەم ڕەزاگرانە هەڵ بگرێت؟ بۆیە بە دەگمەن لەگەڵ خەڵك دا دەگونجێت و کەمیش لە ژیاندا بەسەر دەکەوێت؟ هەروەها تاقانەی خێزانێك فێری هاوگونجان نابێت، چونکە کەس نییە یاری لەگەڵ دا بکات و تیٚکەڵی ببێت. کەچی کوڕی تاقانە هەروەکو خوشکەکانی هەڵ دەکەوێت و لە قسەو داب و نەریت و هەڵسوکەوتیدا خاسیەتی مێینە وەردەگرێت و زۆریش بەناز دەبێت و دەبێتە جەلادی خوشکەکانی. کەچی کچی تاقانەی دایك و باوکی خۆشەویستە و لە زۆربەی بارو دۆخ دا هەڵسوکەوتی کوڕانەی هەیە. بۆ ئەوەی منداڵی تاقانە بە ئاسایی ژیان بباتە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە دەخەینە بەرچاوی پەروەردکاران:-

١- لە ئەندازە بەدەر ئاوڕی لیٚ نەدرێتەوە، با فێربێت چۆن شان بداتە بەر ژیان. ((هیلین مزازی)) لە ساڵی ١٩٥٣دا دیتی: ئەو منداڵانەی کە دایکیان بەناز وفیز بەخێوی کردوون و لەرادەبەدەر ئاوڕی لیٚداون دووچاری نەخۆشییەکانی دەروونی هاتوون. کەچی لیٚکۆڵینەوەکانی ((کاترین مایلز)) لە ساڵی ١٩٤٥دا بەدیاریان خستووە: ئەو باوکانەی سەرۆکایەتی ماڵ دەکەن وزۆر بەتەنگی پاراستنی منداڵیان نین وبەشداری لیٚ پرسیاری یان دەکەن وبۆ سەربەستیی بیروکار وبڕیاردان وبەکارهێنانی وزەو توانایان هانیان دەدەن، ئەو منداڵانە سەرکەوتوونە وماف وبیروڕایان لەناو خێزان دا سەنگیان هەیە.

٢) سەربەستی یەکی فراوان بۆ یاری کردن وجموجوڵ وداهێنان وپشکنینی بدرێت.

٣) هەر لەو ساتەی بیەوێت خزمەتی خۆی بکات، بادەرفەت بۆ ئەم ئارەزووەی بدرێت.

٤) دەبێ فێری هەر دوو ڕێبازی دان وسەندن بکرێت.
٥) بۆ دیدەنی خزم ودراوسێی خێزان هان بدرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵـەکانیان دا تـێ کـەڵ بێت ولـەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی ڕابێت.
٦) دەبێ سنوورێك بۆ خواستە بێ جێ یەکانی دابنرێت وپوخت بکرێن.
٧) هەر چەندەکی منداڵی تاقانە خۆشەویستە، بەڵام خۆشـەویستی لـەوە دایە بی کەنـە ڕۆڵێکـی کاریگەرو سوود بەخش وفێری بکەن چۆن لـە دوا ڕۆژدا بژێت وئاسوودە بێت ونەبەزێت.
٨) نابێ بەهیچ کلۆجێك کوڕ وکچی تاقانە لـە منداڵانی تر جیا بکرێنەوە، بەڵکو بەڕێبازی هاو مامەڵە هەڵسوکەوتیان لـەگەڵ بکرێت. کـارێکی نامرۆڤانەیـە یـە کێکیـان ببێتـە جـەلادی مـاڵ وئەوانەی تریش ببنە بەندو کۆتەی فەرمان وخواستە بێ جێ یەکانی. با داد ویەکسانی وسـۆزی مرۆڤایەتی دروشمی خێزان بن ومنداڵەکانیش ئەم سیفەتانە بۆ ژیانیان دەپەرژێنن وچاکەیان لـە بـیر ناکەن وخوای مەزن پاداشتیان دەداتەوە. هەروەکو ((پیرە مێرد)) وەتەنی:

| | |
|---|---|
| کە منداڵ تەربیەی نەدرێ | بەگەورەیی خووی خراپان ئەگرێ. |
| ئەوەی تەربیەتی ئەولادی نەدا | هەموو ڕەنجی خۆی ئەدا بە بادا. |

## سەرچاوەكانى ئەم بەرهەمە

١-محمد عطية الابراشي، جان جاك روسو واراؤهُ في التربية والتعليم/ ط٢ منقحة دار احياء الكتب العربية مصر ١٩٥١.

٢-كونستاس فوستر وزميله ترجمة د. ابراهيم الحافظ/ كيف تكون أباً ناجحاً؟ ط٢ / مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر/ القاهرة ١٩٦٠.

٣-د. ضياء الدين أبو الحب الطفولة السعيدة وبعض منغصاتها/ ط٢ مطبق شفيقم بغداد

٤-د. ضياء الدين أبو الحب الطفل هذا الكائن العجيب/ منشورات وزارة الثقافة والاعلام/ بغداد ١٩٧٩.

٥-زكية عزيز حقوق الطفل خلال الاعوام الاولى/ مطبعة مصر/ القاهرة ١٩٥٦.

٦-د. عبد العزيز القوصي اسس الصحة النفسية/ ط٧/ مكتبة النهضة المصرية القاهرة ١٩٦٩.

٧-د. عبد العزيز القوصي علم النفس/ أسسه وتطبيقاته التربوية/ مكتبة النهضة المصرية ١٩٥٤.

٨-صالح الشماع/ اللغة عند الطفل من الميلاد الى السادسة/ دار المعارف مصر ١٩٥٥.

٩-د. دجلاس توم/ ترجمة د. اسحق رمزي/ مشكلات الاطفال اليومية/ دار المعارف/ مصر ١٩٥٣.

١٠-جان شك جووسمان وايداليشان ترجمة محمد عبد الحميد ابو المعزم/ كيف يلعب الاطفال/ مكتبة النهضة المصرية.

١١-صبحي عبد اللطيف المعروف علم نفس الطفل والمراهق ومشاكل انحراف الأحداث/ مطبعة الحداد البصرة/ ١٩٧١.

١٢-اجاثا. هـ. باولي/ ترجمة د. وهيب ابراهيم سمعان وزميله/النمو الطبيعي للطفل/ ١٩٥٧

١٣-وليم جيمس/ ترجمة محمد علي العريان/ أحاديث للمعلمين والمتعلمين/ القاهرة ١٩٦١

١٤-منشورات مكتب الاطفال بالولايات المتحدة الامريكية/ ترجمة بهية فرج الله زكي الكردي/ الطفل من الاولى الى السادسة/ مطبعة الاعتماد/ مصر.

١٥-د. بنيامين سبوك/ ترجمة عدنان كيالي وايلي لاوند/ موسوعة العناية بالطفل المؤسسة العامة للدراسة والنشر ط٢ ١٩٧٥.

١٦-د. بنيامين سبوك/ ترجمة منير عامر حديث الى الأمهات/ المؤسسة العامة للدراسات والنشر بيروت/ ١٩٧٧.

١٧-د. بنيامين سبوك/ ترجمة منير عامر/ مشاكل الاباء في تربية الأبناء/ المؤسسة العربية للدراسات والنشر ط٣/ بيروت ١٩٧٩.
١٨-د. صبري القباني/ طبيبك معك/ ط١٤- دار العلم للملايين بيروت ١٩٧٩.
١٩-د. صبري القباني/ الغذاء لا الدواء دار العلم للملايين/ بيروت ١٩٧٩.
٢٠-د. صبري القباني/ أولادنا كيف نصارحهم ؟ ط١/ ١٩٥٨.
٢١-سمير شيخاني/ سبيلك الى السعادة والنجاح/ ط٣/ دار الافاق الجديدةم بيروت ١٩٨٠.
٢٢-د. زكريا ابراهيم/ سيكولوجية المرأة دار مصر للطباعة.
٢٣-لورانس وماري فرانك/ ترجمة عبد المنعم الزيادي السعادة امرأة/ ط١ مؤسسة الخانجي/ القاهرة ١٩٥٨.
٢٤-د. محمد عثمان نجاتي/ علم النفس في حياتنا اليومية/ ط٥ منقحة/ دار النهضة العربية/ ١٩٦٦.
٢٥-سعد المغربي/ انحراف الصغار/ دار المعارف/ مصر/ القاهرة ١٩٦٠.
٢٦-معروف مصطفى زريق خفايا المراهقة/ دار اليقضة العربية للتأليف والترجمة والنشر/ دمشق ١٩٦٠.
٢٧-نخبة من أساتذة علم النفس والتربية والطب/ ترجمة عبد المنعم الزيادي/ طفلك بين الثانية والخامسة/ ط١ / ١٩٥٩.
٢٨-النمو النفسي/ د. عبد المنعم المليجي/ منشورات مكتبة مصر.
٢٩-سلامة موسى/ محاولات سيكولوجية/ منشورات مكتبة الخانجي مصر/ ١٩٥٣.
٣٠-سلامة موسى/ عقلي وعقلك/ مكتبة الخانجي مصر/ ١٩٦٤.
٣١-سلامة موسى/ طريق المجد للشباب مطبعة التقدم/ القاهرة ١٩٦٤.
٣٢وليم. آي. هنري/ ترجمة عبد المنعم الزيادي/ استكشف شخصيتك/ مكتبة النهضة المصرية/ ١٩٦١.
٣٣-ماثيو تشابل/ ترجمة عبد المنعم الزيادي شفاءُ القلق/ القاهرة/ ١٩٥٨.
٣٤-د. أحمد عزت راجح اصول علم النفس/ط٦ / مطبعة الشاعر/ الاسكندرية/ ١٩٦٦.
٣٥-د. علي كمال/ النفس انفعالاتها أمراضها وعلاجها/ بغداد/ ١٩٦٧.
٣٦-د. محمود البسيوني/ الفن والتربية/ دار المعارف مصر/ ١٩٥٧.
٣٧-د. نوال السعداوي/ الرجل والجنس/ المؤسسة العربية للدراسات والنشر القاهرة ١٩٧٥.
٣٨-د. فاخر عاقل/ اعرف نفسك دار العلم للملايين ط٥ /بيروت/١٩٧٨.
٣٩-د. طلعت منصور، د. أنور الشرقاوي، د. عادل عزالدين، د. فاروق ابو العوف أسس علم النفس العام/ مكتبة الانجلو المصرية.

٤٠-مصطفى فهمي/ سيكولوجية الطفولة والمراهقة دار مصر للطباعة/ ١٩٧٤.
٤١-كاستون كورترا/ فن تربية الأطفال في هذا العصر/ حلب/ ١٩٥٤.
٤٢-الموسوعة الصغيرة/١٢٣ ترجمة خضر عباس اللامي/ مقالات في التربية الحديثة منشورات دار الجاحظ للنشر/ بغداد ١٩٨٣.
٤٣-السيد فؤاد البهي/ الأسس النفسية للنمو/ط٤ دار الفكر العربي/ القاهرة/ ١٩٧٥.
٤٤-سيرجون انجليش وزميله/ ترجمة د. السيد محمد خيري/ المشاكل الانفعالية للنمو/ط٢ /مكتبة النهضة المصرية/ القاهرة ١٩٥٤.
٤٥-جون ديوي/ ترجمة محمود البسيوني الخبرة والتربية دار المعارف مصر/ ١٩٥٤.
٤٦-حمزة مختار/ مشكلات الاباء والابناء / الشركة العربية/ بيروت ١٩٥٩.
٤٧-اسكالونا سيبيك/ ترجمة عبد المنعم المليجي/ عدوان الاطفال/ مكتبة النهضة المصرية ١٩٦١.
٤٨-اليس وتيزمان/ ترجمة فؤاد البهي/ التربية الاجتماعية للاطفال/ مكتبة النهضة المصرية القاهرة ١٩٥٥.
٤٩-د. محمد خليفة بركات/ عيادات العلاج النفسي/ دار مصر للطباعة ١٩٥٢.
٥٠-د. محمد خليفة بركات/ افهم نفسك/ط١ / مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر ١٩٥٥.
٥١-ترجمة الاستاذ محمد عبد الحميد ابو العزم/ الامانة دائماً/ط٢ /مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر ١٩٦٠.

## ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە

لاپەرە

| ناوەرۆكی ئەم بەرهەمە | لاپەرە |
|---|---|
| هەڵهاتنی قوتابی لەقوتابخانە   هۆیەكانی   چارە سەری. | |
| بەندی حەوتەم/ هـــەرەتی هـەرزەكاری، گەشـەكردنی لەشـی هـەرزەكار، گەشەكردنی هۆشی هەرزەكار، گەشەكردنی دەروونـی هـەرزەكار، چـۆن پاریدەی هەرزەكار دەدەین ؟ | ٩٨-١١٦ |
| بەندی هەشتەم/ شوێنی منداڵ لە زنجیرەی منداڵانـی خـێزانێك دا. منداڵـی نۆبەرە وگیروگرفتەكانی، منداڵی دووەم وگیروگرفتـەكانی، منداڵـی پاشـە بەرەو گیروگرفتەكانی، منداڵی تاقانە وگیروگرفتەكانی. | ١١٦-١٢٤ |
| سەرچاوەكانی ئەم بەرهەمە. | ١٢٥-١٢٧ |
| ناوەرۆكی ئەم بەرهەمە. | ١٢٩-١٣٠ |



# کورتەیەك لەژیانی نووسەر

نووسەری کۆچ کردوو (یەعقوب قەصاب) لەساڵی ١٩٤٠ لەگوندی ئەرموطە لەکۆیە کەسەر بە پارێزگای هەولێرە لەهەرێمی کوردستان لەدایك بووە ، لەساڵی ١٩٤٧دا لەگوندەکەی خۆیان دەستی کردووە بەخوێندنی قۆناغی سەرەتایی .. پاشان قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی لەدواناوەندی کۆیەی کوڕان تەواو کردووە .. دواتر لەساڵی ١٩٥٨ دا چووەتە (خانەی مامۆستایان) لەبەعقوبەو لەساڵی ١٩٦١ دا تەواوی کردووەو بووە بەمامۆستاو پەروەرشیار .

نووسەر لەسەرەتای حەفتاکانەوە گرنگی بەبواری نووسین داوەو سەدان وتاری بەزمانی کوردی و عەرەبی لەرۆژنامەو گۆڤارە عێراقیەکاندا بلاوکردۆتەوە .. تیایاندا دەربارەی چەندەها بابەتی کۆمەلایەتی و مێژوویی قسەی کردووە .. پێش ئەوەی لەساڵی ١٩٩٠ دا نەخۆشی زۆری بۆ بهێنێت ئەم کتێبەی تەواو کردبوو .. بەلام لەبەر باری گوزەران و تەندروستی خۆی نەیتوانی لەماوەی ژیانی خۆیدا بەچاپی بەگەیەنێت .. شایانی وتنە هاوکات لەگەڵ ئەم کتێبەیدا کتێبێکی تریشی تەواو کرد سەبارەت بە مەملەکەتی حەدیاب .. بەپشتیوانی خوا منداڵەکانی لەدوای چاپ کردنی ئەم بەرهەمەی ، ئەوەیشی بۆ بەچاپ دەگەیەنن .

نووسەری کۆچ کردوو پاش ئازار چەشتنێکی زۆر لە ١٢ی ئازاری ساڵی ١٩٩٦دا ماڵئاوایی لەدونیای فانی کرد .. ئەویش بەوەی دڵەکەی لەکارکەوت و مۆڵەتی نەدا کەکاروانی ژیانی لەجیهانی نووسین دا بەپایان بگەیەنێت .. چونکە خوالێخۆشبوو بەئاواتی نووسین و تەواوکردنی چەندین پرۆژەی تر بوو کەلەبیریدا بوو .. لەوانە نووسینەوەی یادگاری و یاداشتەکانی خۆی .. کەئەویش لەگەڵ ئەم بەرهەمەی و هەر لەو وەختەدا تازە دەستی کردبوو بەنووسینی .

خوا لێی خۆش بێت و جێگەی بەهەشتی رازاوە بێت ..